





زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان





# ژیانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

# بۆ منداڵان

نووسینی

نهاد جلال جبيب الله

بسم الله الرحمن الرحیم

ناوی کتێب: ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان.

نووسەر: نهاد جلال حبیب الله.

زنجیرە: زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان(١).

دیزاینی بەرگ: حکیم أبوبکر.

دیزاینی ناوەوە: نهاد جلال.

چاپخانە: ڕێ نوێ.

ساڵ و شوێن و ژمارەی چاپ: ١٤٣٤ کۆچی، سلێمانی، چاپی سێیەم.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

ژمارەی سپاردن: ( ١٤١٤ ) ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.



Nihad.jalal@gmail.com

## پێشکەشە بە



* دایك و باوکی ئازیز و خۆشەویستم خوای گەورە بەهەشت بکاتە بەشیان.

* هەموو جگەرگۆشە و ڕۆڵەیەکی ئوممەتی ئیسلامی.

* خوێندکارانی خوێندنگەی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ).

* هەر تاکێکی مرۆڤایەتی کە بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت.

* هەر موسڵمانێك کە لە نزایەکیش بێت لە بیرم ناکات.

# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس و ستایشی بێپایەن بۆ خوای گەورە، صەلاتو سەلامی خوا بۆ سەر پێغەمبەرمان موحەممەد و ئالوبەیتی پاکی و هاوەڵانی بەرز و بەڕێزی.

پاشان:

سوپاس بۆ خوا دوای ئەوەی بە یارمەتی خوا توانیمان نووسینێکی کورت و پوختی وانەیی لە خزمەت ژیانی سەروەری مرۆڤایەتیدا ئامادە بکەین و برای ئازیز و بەڕێزمان کاك فائق لە کتێبخانەی نارین چاپێکی جوان و بێوێنەی نووسینەکەی کرد لەژێر ناونیشانی (ژیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ منداڵان) و هەردوو مامۆستای بەڕێز مامۆستا گاهر بامۆکی و مامۆستا جمال بێدار پێشەکییان بۆ چاپی یەکەمی نووسی، سوپاس بۆ خوا پێشوازیەکی زۆر گەرموگوڕ لەو نووسینە کرا و بەر گوێمان کەوتەوە منداڵانی ئازیز تامەزرۆی بون و خێرا چاپی یەکەمی تەواو بوو، بۆیە پاش چاوپیاخشاندنەوەیەك بڕیارماندا بە چاپی دووەمی کتێبەکە و پێشەکیەکانی چاپی یەکەمان دانەنانەوە لەبەر کەڵکە نەبوونی پێشەکیەکان بەسەر یەکدا تا منداڵانی ئازیز ماندوو نەکەین.

هاوکات مامۆستای ئازیز و خۆشەویست مامۆستا فازیل خوا پایەداری بکات هەستا بە وەرگێڕانێکی جوانی کتێبەکە بۆ زمانی ئینگلیزی، برێك تێبینی جوانیشی پێشکەش کرد، خوای گەورە ئەو کارە بە ترخەی بخاتە تای چاکەکانی و خۆی پاداشتی بەخێری بداتەوە.

هیوادارم لە ئازادا کەس لەو برا و مامۆستایانە لەبیر نەکەن کە دەستیان هەبووە لە بەرێخستنی ئەم کارەدا.

وما توفیقی إلا بالله علیه توکلت و إلیه أنیب

نهاد جلال حبیب الله

Nihad.jalal@gmail.com

# بۆ خوشك و برا ئازیزەكانم

خوشك و برایانی ئازیز، ئەوانەی ئەم نووسینە دەخوێننەوە بۆ منداڵەكانتان یان بۆیان باس دەكەن یان ڕوونكردنەوەی لەسەر دەدەن:

ڕۆژگارێك كە چوومە خزمەت ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)، جار جارێك لەگەڵی دەچوومە ناو مەككە و ئازار دەدرام و خۆم ڕادەگرت، جاری وا هەبوو دەیگریاندم، جار جاریش دەیخستمە خەندەو پێكەنین، دەستی دەگرتم و دەیبردم بۆ نوێژ و بەرنوێژی بۆ دەكردم، فێری قورئانی دەكردم، سەلامی لێ دەكردم، جاریش هەبوو كەناری دەگرت و ماڵئاوایی لێ دەكردم، ئەو كات من زانیم ژیان لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە ئازیزە وا چەندە خۆشە، گریان و خەندە و جەنگ و خۆڕاگری خۆشی و ئازار و هەر جۆرە بارێكی ژیان لەگەڵ ئەو ئازیزەدا بەسەر دەبەین، خوشك و براكانم ئەوە بە جوانی وەربگرن كە پێویستە بەو جۆرە بچینە نێو ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)، كە ئەو ئازیزەمان پێی ژیاوە، ئەوەك بمانەوێت پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە بژیت كە ئێمە دەمانەوێت.

بروانن ڕۆژانێك خۆڕاگری و ئازار و ئەشكەنجە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، جاری وا هەبوو شەوخونی و شەو نوێژی و كەنارگیری دەكرد، جاری وایش هەبوو تێكەڵی خەڵك و قسە و بزە و وتاردان، هەندێ جار تووڕە و هەندێ جار لەسەر خۆ بوو.

دەی با ئێمەش یەك باری ژیانی ئازیزمان وەرنەگرین هەمووی بە باشی سەیر بكەین و وەربگرین و باسی بكەین بۆ منداڵەكانمان، نەوەك چاو داخەین لە هەندێ بەشی ژیانی ئەو ئازیزەمان، بەڵكو هەمیشە لە بیرمان نەچێت ئێمە ژیانێك دەخوێنینەوە كە خوای گەورە لە بارەیەوە دەفەرموێت:(لقد كان لكم فى رسول الله أسوة حسنة).

# بەشی یەکەم

## شوێنی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبەر (ﷺ) لە شارێکدا لە دایك بوو کە پێی دەوترا مەککە،[١] ئەو ناوچەیە لە حیجازدایە، ئەمڕۆ وڵاتەکە ناسراوە بە «مەملەکەتی عەرەبی سعودی».

ئەم شارە ناوچەیەکی وشك و کەم بارانە، چوار دەوری شاخاویە.[٢]

لەم شارەدا بینایەکی تێدایە پێی دەوترێت کەعبە، ئەم کەعبەیە یەکەمجار لە سەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا دروستی دەکەن.[٣]

ئەم شارە لە ڕووی ئابوورییەوە گرنگیەکی گەورەی هەبوو، چونکە کاروانە بازرگانیەکان لە ناوچەکانەوەشتومەکیان دەکڕی و دەیان بردەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان یان بۆ شارەکانی تر، لە ڕێگەدا تێپەڕ دەبوون بە شاری مەککەدا.[٤]

هەروەها لە ڕووی ئاینیەوە گرنگ بوو، چونکە کەعبەی تێدا بوو، هەمووان دەهاتن بۆ ئەوێ بۆ لای کەعبە و شارەکە و قەرەباڵغ دەبوو، خەڵکی ناوچەکە بەگشتی عەرەب بوون بە زمانی عەرەبی قسەیان دەکرد.[٥]

پرسیار: خەڵکی شاری مەککە چۆن دەژیان؟

وەڵام: خەڵکی شاری مەککە دابەش بووبوون بۆ چەند کۆمەڵێك:

١- هەندێکیان سەرقاڵی بۆنەی ئایینی بوون و پێشوازیان لە خەڵك دەکرد و ناویان پێ دەدان و فێری بۆنە ئاینەیەکانیان دەکردن.

---

[١]. محمد مەلا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لاپەڕە (١٤).

[٢]. عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢١-٢٢).

[٣] ـ د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٢).

[٤]. حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٤٢).

[٥]. د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٢-٢٣).

٢- هەندێك پاراستنی كاری شارەكەیان لە ئەستۆ گرتبـوو ئەمانـە ماڵیـان لـە دەرەوەی شارەكەدا بوو.

٣- دەستەیەك لە خەڵكی شارەكە بازرگان بوون وشتومەكیان دەكـڕی و دەفرۆشـت و بـە زسـتان و هاویندا كاروانی بازرگانیان هەبوو.

٤- كەمێك لە خەڵكەكەیش سەرقاڵی پیشەسازی بوون و شمشـێر و چـەك و شـتی تریـان دروست دەكرد.

**تێبینی**:

خەڵكی شارەكە سێ جۆر بوون:

* جۆری یەكەم: دەوڵەمەندەكان بوون، كاروباریـان لـە دەسـتدا بـوو و سـتەمیان دەكـرد لەوانی تر و هەرچیان بویستایە دەستیان دەكەوت.

* جۆری دووەم: كۆیلەكان بوون، واتا ئەوانەی دەوڵەمەندەكان یان خەڵكەكەی تر لە كـاتی جەنگدا دەیانگرتن و دەیانهێنان تا ئیشیان بۆ بكەن، ئەم كۆیلانە هەژار و كەم دەست بـوون و دەبوو هەمیشە ئیش بكەن و بۆ گەورەكانیان، ئەوان نانی باشیان نەبوو تا بیخـۆن، سـەرما و گەرما ئازاری دەدان و ژینیان خراپ بوو.

* جۆری سێیەم: خەڵكی ئاسایی بوو كە ژیانیان سادە بوو، ئەمانە نە كۆیلـە بـوون و نـە دەوڵەمەند و نە دەسەڵاتدار، بەڵام ژیانیان ئاسایی و ساكار بوو.

لە مەككەدا ئافرەت وەك سوك و گاڵتەجار و كەم سەیر دەكرا، هەر ماڵێك كچـیان بوایـە بە دزیەوە دەیان كوشت و نەیان دەهێشت كـەس بزانێـت، كـە كچـیان بـووە، ئـەوان چـاڵیان هەڵدەكەند و كچەكەیان دەخستە چاڵەكە و خۆڵیان دەكرد بـە سـەریا، بـەڵام كوڕیـان خـۆش دەویست.[١]

[١] ـ حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (٦٣-٧٦).

خەڵكی شارەكە بتیان لە بەرد و دار و شتی تر دروست دەكرد و دەیان پەرست و سوجدەیان بۆ دەبرد و دوعایان لەلا دەكردن، ئەوان باوەڕیان نەبوو بە خوای گەورە و لە جیاتی خوا بتیان دەپەرست و بێ باوەڕ بوون، خەڵكەكەی داوێن پیس و خراپەكار و ناپاكبوون و لە نێوان خۆیاندا خراپ بوون،[1] ئەوان خۆیان بە گەورە دەزانی و تێكەڵی خەڵكی تر نەدەبوون.[2]

خەڵكەكە ئاویان لە بیرەكانەوە هەڵدەگۆزی، چونكە ناوچەكە زۆر وشك بوو.[3]

لەو كاتەدا چەند دەوڵەتێكی بە هێز هەبوون كە بریتی بوون لە:

*یەكەم: فارسەكان: لەم دەوڵەتەدا پاشا ستەمكارەكان فەرمانڕەواییان دەكرد و خەڵكەكەیان ئاگر پەرست بوون و ئایینی ناڕاستی زۆر بڵاو بوونەوە، خەڵكی مەی و خۆراكی حەرامیان دەخوارد و دەخواردەوە، ئەم دەوڵەتە دەوڵەتی ساسانی بوو دواتر موسڵمانەكان لە ناویان بردن.

*دووەم: ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان: ئەمانیش سەرقاڵی لاسایی و ستەمكاری بوون خۆیان پێیان وا بوو كە مەسیحین، بەڵام لایاندابوو لە دینی ڕاستی پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) و دابوویانە تاوان و گوناه و چەند خوایەكیان دانابوو بۆ خۆیان.

*سێیەم: هیند: ئەمەش دەسەڵاتی ناوچەكانی هیندستان بوو، كە ئەمانیش دواكەوتوو و نەزان و ستەمكار بوون و خوایان نەدەپەرست و ئاژەڵ و بتیان دەپەرست.[4]

پرسیار: گرنگترین ئاینەكانی ئەو سەردەمە چی بوون؟

وەڵام:

١- ئایینی جولەكە.

٢- ئایینی مەسیحی.

---

[1] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٢٤).

[2] ـ د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٢ بۆ ٣٢).

[3] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (٢١).

[4] ـ د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (١٣-١٥).

٣- ئایینی بوذی.

٤- ئایینی بەرهەمی.

٥- ئاینی زەردەشتی.

٦- ئایینی مانی.

٧- ئایینی مەزدەکی.[1]

پرسیار: ئەو سیفەتانە چی بوون کە خەڵکی مەککە و دەوروبەری مەککە هەیانبوو؟

١- ئەوان بیر تیژ و لێزان بوون.

٢- رێزی میوانیان دەگرت و لە روویدا سەخاوەتمەند بوون و چی باش و خۆش بوایە بۆیان دادەنا.

٣- ئازا و نەترس بوون و یارمەتی ستەم لێکراویان دەدا، بەڵام بە کەمی.

٤- حەزیان لە ئازادی بوو و ئامادە نەبوون بچنە ژێر دەسەڵاتی هیچ دەوڵەتێك.[2]

## رەچەڵەکی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) بە رەچەڵەك دەگەرێتەوە سەر ئیسماعیل و ئیبراهیم (علیهم السلام)، پێغەمبەر(ﷺ) عەرەب نەبووە لە رەچەڵەکدا، بەڵکو باوك و باپیرانی زووتر هاتوون بۆ ناو عەرەب و تێکەڵی عەرەب بوون و ئەوانیش وەك عەرەبیان لێ هاتووە.[3]

باپیری پێغەمبەر ناوی عبدالمطلب بوو، عبدالمطلب منداڵی نەبوو، داوای کرد کە خوای گەورە منداڵی زۆری پێ ببەخشێت یەکێکیان دەکاتە قوربانی بۆ خوا، کاتێك خودا منداڵەکانی پێ دەبەخشێت، عبدالمطلب تیر و پشك دەکات تا بزانێت کامیان بکاتە قوربانی،

[1] ـ هەمان سەرچاوە لاپەرە (١٥-١٩).
[2] ـ هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٣٢-٣٧).
[3] ـ ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەرە (١٨).

ئەو کات ناوی یەکێکیان دەردەچێت و کە ناوی عبداللە بوو، بەڵام نە باوکی و نە براکانی عبداللە حەزیان نەدەکرد عبداللە سەر ببڕدرێت، بۆیە تا سێ جار تیر و پشکیان کردەوە کەچی هەر ناوی عبداللە دەردەچوو، دواتر چوونە لای زانایەك و بە پێی قسەی بڕیاریاندا لە جیاتی عبداللە سەد وشتر سەر ببڕن، بەمە عبداللە ڕزگاری بوو، عبداللە کوڕێکی جوان و باڵابەرز بوو، هەرچی خەڵك بوو حەزیان لە جوانی عبداللە بوو، عبداللە کچێکی هێنا و بوو بە هاوسەری کە ناوی ئامینە بوو، ئامینەش کچێکی هێدی و جوان و ژیر بوو، بنەماڵەیەکی ناسراو و ڕێك و پێکی هەبوو.[1]

عبدالمطلب لە لایەن خواوە بیری زەمزەمی پێ بەخشرا، ئەو کەسێکی ناسراو و ناوداری نێو مەککە بوو و هەمووان ڕێزیان لێ دەگرت.[2]

جارێك عبداللە دەچێت بۆ بازرگانی و لە ڕێگادا دەمرێت،[3] کەچی پاش ماوەیەکی کەم لە دوای مردنی ئامینەی خێزانی منداڵێکی دەبێت و هەمووان پێی دڵخۆش بوون، عبدالمطلب لە خۆشیدا کەنیزەکێکی ئازاد کرد و ناوی منداڵەکەی نا (محمد) واتا سوپاسکراو،[4] ئەو محمدەیش پێغەمبەری ئازیزی ئێمە بوو کە لەگەڵ لە دایك بوونیدا بڕیاری گۆڕانی مرۆڤایەتی داو کەوتە کار، پێغەمبەرێك کە باوکی خۆی نەبینی و بە بێ برا و خوشك دونیای بینی و هاتە دونیا، ئەو ڕۆژەش ناسراوە بە ڕۆژی لە دایك بوونی پێغەمبەر محمد(ﷺ).

تێبینی: پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە دایك بێت کەسێکی ستەمکار بەناوی ئەبرەهە بینایەکی دروست کرد لە ناوچەی خۆی لە جیاتی کەعبە و فیلی زۆری کۆکردەوە و لەگەڵ سوپایەکدا و هات بۆ لەناوبردنی و ڕووخاندنی، کەعبەی پیرۆز، بەڵام خوای گەورە کۆمەڵێك باڵندەی بۆ ناردن کە بەردی بچووکیان پێ بوو و لە ئاسمانەوە بەردەکانیان فڕێ دا بەسەر فیل

[1] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٤٠-٤٣).

[2] ـ ابن الاثیر: الکامل في التأریخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٦١٥).

[3] ـ ابن هشام، السیرة النبویة، لاپەڕە (١٥٣).

[4] ـ حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٠٧).

و سەربازەکاندا و سوپاکەی ئەبرهە لە ناوچوو خوای گەورە کەعبەی پاراست لە دەستی ئەو خراپەکارانە.[١]

پرسیار: چ سورەتێك باسی ڕووداوەکەی ئەبرهە دەکات؟

وەڵام: سورەتی (الفیل).

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) لە چ ڕۆژێکدا لە دایك بوو؟

وەڵام: لە ڕۆژی دوو شەممە لە ١٢ی مانگی ربیع الاول لە دایك بوو.

پرسیار: بۆچی خوای گەورە نەیهێشت پێغەمبەر(ﷺ) باوکی ببینێت و پێش ئەوەی لە دایك بێت مرد؟

وەڵام: بۆ ئەوەی هەر لە منداڵیەوە فێری خۆڕاگری و مەردایەتی بێت و تەنها پشتی بە خوا ببەستێت.

[١] ـ ابن هشام، السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٣-٧٣).

## ژیانی منداڵی پێغەمبەر (ﷺ)

لەو سەردەمەدا وا باو بووە منداڵ دەنێردرایە لادێ تا زمانی پاراو بێت و لە ئاو و هەوایەکی خۆش و پاکدا گەورە بێت شارەزایی بار و دۆخی ژیانی لادێ ببێت تا دواتر بتوانێت کەسێکی لێهاتوو بێت.

پێغەمبەر کە لە لای باپیرەی و لەگەڵ دایکی ژیانی بەسەر دەبرد، لە لایەن باپیرەیەوە نێردرا بۆ لادێ تا لەوێ گەورە ببێت، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە هێشتا پێغەمبەر شیری دەخوارد و زۆر منداڵ بوو.

عبدالمطلب پێغەمبەری دایە دەست خێزانێکی هەژاری نێو لادێ کە ناوی ئەو ژنە حەلیمە بوو.[1]

پرسیار: حەلیمە واتای چیە؟

وەڵام: بە واتای نەرم و نیان و هێدی و خاوەن سۆز دێت ئەمەش بۆ ئەوەی ڕەفتاری پێغەمبەر(ﷺ) لە دواتردا بەو جۆرە بێت، حەلیمە لەگەڵ مێردەکەی و منداڵەکانیدا چوون بە لای مەککەدا، ئەوان گوێ درێژێکی بێ توانا و خاو و خلیچکیان هەبوو و لە هاو ڕێگاکانیان دواکەوتبوون، بەڵام نەیاندەزانی ئەو دواکەوتنە هۆکاری بەختەوەر بوونیانە و خوای گەورە یارمەتیان دەدات، ئەوان کاتێك پێغەمبەریان برد بۆ لای خۆیان گوێ درێژەکەیان بە هێز و بە پەلە بوو، کەوتنە پێش هاوڕێکانیان، هاوڕێکانیشیان بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکردن.[2]

پرسیار: چ سوودێك وەردەگرین لەم ڕووداوەدا؟

وەڵام: لەم ڕووداوەدا فێری ئەوە دەبین کە هەندێ شت هەیە لای ئێمە باش و خۆش نیە، بەڵام لای خوای گەورە باشە و سوودی هەیە بۆ ئێمە، چونکە حەلیمە و مێرد و منداڵەکانی حەزیان نەدەکرد دوا بکەون، کەچی خوای گەورە بە هۆی ئەو دواکەوتنەوە پێغەمبەری دانە دەست کە بە پەلە خوای گەورە ژیانی خۆش کردن و وای کرد لە هەژاری ڕزگاریان ببێت..

---

[1] ـ محمد مەلا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لاپەڕە (١٧).

[2] ـ عەبدولعەزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٥٨-٦١).

هەروەك فێری ئەوە دەبین كە هەرگیز بێ هیوا نەبین لە خوای گەورە، چونكە خـوای گـەورە هەمیشە ئاگای لە ئێمەیە تەنانەت كاتێك ئێمە دەخەوین و ئاگامان لە خۆمـان نیـە، خـوای گەورە ناخەوێت و ئاگای لە ئێمەیە.

بەڵێ!.. حەلیمە پێغەمبەری بردەوە لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ لادێ، لـەوێ ئـەركی شـیرپێدان و گـەورەكردن و پـەروەردەكردنی پێغەمبـەری گرتـە ئەسـتۆی خـۆی، كاتێـك بینـی بـەهۆی پێغەمبەرەوە لە هەژاری ڕزگاریان بووە و مانگاكانیان شیریان زیاتر بووە و گـوێ درێژەكـەیان بەهێز بووە و خۆراكیان زۆر بـووە حـەزی دەكـرد زیـاتر گرنگـی بـە پێغەمبـەر بـدات بۆیـە دەیویست شیری هەردوو مەمكی بدات بە پێغەمبەر، بەڵام پێغەمبەر تەنها بەشـەكەی خـۆی دەخوارد و دوای ئەوە هیچی نەدەخوارد.[١]

پرسیار: چ وانەیەك فێر دەبین لەم ڕەفتاری پێغەمبەردا؟

وەڵام: فێر دەبین تەنها بەشی خۆمان بخۆین و بەشی زیاتر نەخۆین، چونكە خـەڵكی تـریش وەك ئێمە مرۆڤن و گوناهە بەشەكەیان بخۆین.

ئەگەریش گەورەكانمان ویستیان بەشی برا و خوشك و هاوڕێكانمان بـدەن بـە ئێمـە، نابێـت ئێمە لەم كارە قبووڵ بكەین و دەبێت لە بەشی خۆمان زیاتر نەبەین.

---

[١]ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٤٧-٤٨).

*** ڕووداوێکی گرنگ:**

ڕۆژێکیان پێغەمبەر لەگەڵ منداڵەکانی حەلیمەدا کە برای شیری پێغەمبەر بوون چوون بۆ دەرەوە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان، لەوێ کەوتنە گاڵتە و یاری کردن لە ناکاو دوو کەسی گەورەی جلوبەرگ سپی کە قاپێکی زێڕینیان پێ بوو هاتن و پێغەمبەریان گرت و سنگیان هەڵدڕی، منداڵەکان تەواو ترسان و ڕەنگیان گۆڕا و بە پەلە ڕایان کردەوە بۆ ماڵ و هەواڵیان دا بە دایکیان، کە دوو پیاو پێغەمبەریان کوشت و حەلیمەش بە پەلە ڕای کردە دەرێ و چوو بۆ لای پێغەمبەر سەیر دەکات پێغەمبەر چاک بووەتەوە، بەڵام ترساوە و ڕەنگی زەرد بووە و بێ تاقەت دیارە، بۆیە حەلیمە زانی ئەو ڕووداوە ڕاستە، حەلیمە ترساو بڕیاریدا پێغەمبەر بباتەوە بۆ لای باپیرەی و دایکی لە ترسی ئەوەی شتێکی بەسەر نەیەت.[1] بەمە پێغەمبەر لە ژیانی لادێ و گوندەوە چوویەوە بۆ ژیانی قەرەباڵغی و شار و لە برا شیریەکانی دوورکەوتەوە.

پرسیار: ئەو دوو کەسە کێ بوون سنگی پێغەمبەریان هەڵدڕی؟ ئەی بۆچی وایان کرد؟

وەڵام: ئەو دوو کەسە دوو فریشتەی میهرەبانی خوای گەورە بوون، ئەوان هاتن تا چی پیسی و خراپە هەیە لە دڵی پێغەمبەردا لایەن و لە جیاتیدا چاکەیان دانا و دڵی پێغەمبەریان لە قاپێکی زێڕیندا شۆرد.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:

١- فریشتەکان ئێمەیان خۆش دەوێت و چاکەی ئێمەیان دەوێت نەوەک خراپە.

٢- ئەبێت هەوڵ بدەین خراپەکانی ناو دڵمان بگۆڕین بۆ چاکە، ئەویش بەوە دەبێت کە لە جیاتی قسەی خراپ قسەی چاک بڵێین و لە جیاتی کاری خراپ کاری چاک بکەین.

---

[1] ـ حبيب محمد سعيد: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٢٣-١٢٨).

## • گەشت و سەفەری پێغەمبەر لەگەڵ دایکیدا:

پاش ئەوەی پێغەمبەر گەڕایەوە بۆ لای دایکی و باپیری، بڕیار بوو لەگەڵ دایکیدا بچن بۆ سەفەر بۆ لای خاڵ و خزمانی دایکی بۆیە کەوتنە ڕێ و لەگەڵ دایکیدا سەردانی خزم و کەسوکاریان کرد ماوەیەك لە لای ئەوان بوون، پێغەمبەر لەوێ لەگەڵ دایکیدا بوو و لێی جودا نەدەبوویەوە.[1]

پرسیار: چی فێر دەبین لەم گەشتەی پێغەمبەر لەگەڵ دایکیدا؟

وەڵام:

١- فێر دەبین کە سەردانی خزم و کەس و کار ئەرکی سەر شانمانە و دەبێت هەمومان بچین بۆ سەردانی خزم و کەسوکاری دایك و باوکمان.

٢- نابێت بڵێین خزمەکانمان دوورن و نەچین، بەڵکو دەبێت هەر بچین بۆ لایان.

٣- دەبێت هەمیشە لەگەڵ دایك و باوکماندا بین، چونکە ئەوان ئاگایان لە ئێمە دەبێت، هەروەها ئەوان ئێمەیان خۆش دەوێت، بۆیە دەبێت ئێمەیش ئەوانمان خۆش بوێت.

## ڕووداوێکی دڵتەزێن:

کاتێك پێغەمبەر لەگەڵ دایکیدا دەگەڕانەوە بەرەو شاری مەککە بۆ ماڵی خۆیان، لە ڕێگەی نێوان مەدینە و مەککەدا دایکی پێغەمبەر(ﷺ) دەمرێت و پێغەمبەریش بە تەنها لەو ڕێگەدا دەمێنێتەوە خەڵکی دەیبەنەوە ماڵەوە ئەمجا کە سەیری ماڵەوە دەکات نە باوك و نە دایك و نە خوشك و نە برای تێدا نیە و بە تاقی تەنها ماوەتەوە لە ماڵەکەدا و باپیری لەگەڵیدا دەبێت.[2]

وانە و ئەزموونەکانی ئەم ڕووداوە:

---

[1] د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەرە (٥٣).
[2] محمد مەلا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لاپەرە (٢٤-٢٧).

١- لەم ڕووداوەدا فێر بووین کە مردن هەمیشە لە ڕێگەدایە و کەس نازانێت کەی دەمرێت، بۆیە دەبێت هەمیشە کردەوەی چاك کۆ بکەینەوە تا ئامادە بین بۆ مردن تەنانەت ئەگەر لە خۆشترین کاتدا بێت، چونکە دایکی پێغەمبەر لە سەفەردا مرد.

٢- نابێت ئێمە بە مردنی کەس و کارمان بێ هیوا بین و واز بهێنین چونکە پێغەمبەر(ﷺ) زۆربەی کەس و کاری مردن، کەچی وازی نەهێنا تا ئەم ئاینەی گەیاند.

٣- با کەس و کار و خزم و دایك و باوکیشمان بمرن، ئێمە هەر بێ کەس نین، چونکە ئێمە خوای گەورەمان لەگەڵدایە کە هەرگیز نامرێت و لە دایك و باوك و کەس و کارمان زیاتر ئێمەی خۆش دەوێت و بۆ ئێمە باشترە.

## ژیان لەگەڵ باپیریدا

پێغەمبەر ئەمجارەیان لەگەڵ باپیریدا ژیان دەباتە سەر ئەو کوڕێکی ژیر و هێدی و لەسەر خۆ بوو، هەمیشە هەوڵی دەدا بە جۆرێك یارمەتی باپیرەی بدات، چونکە باپیرەی پیر و پەککەوتە و بێ توانا بوو، بۆیە بڕیاری دا بچێت بۆ کاری شوانەیی و لە بەرامبەردا پارەی بدەنێ تا خەرجی خۆی و باپیرەی پێ پەیدا بکات.[١]

ئەو ڕۆژانەی دەچوو بۆ ئیش و شوانیی دەکرد مەڕ و ماڵاتی خەڵکی شاری مەککەی دەلەوەڕاند، ئەمە خواستی خوای گەورەی لەسەر بوو، چونکە کاری شوانیی چەند سوود و ئەزموونێکی هەیە، لەوانە:

١- لە شوانیدا فێری نەترسی و ئازایەتی دەبێت: چونکە لەگەڵ ئەو هەموو ئاژەڵانەدا دەچێت بە دەشت و کێودا و ناترسێت لە ئاژەڵی دڕندە و دز و جەردە و ناحەز و هەوڵ دەدەیت ئاژەڵەکان بە ساغی ببەیت و بهێنیتەوە.

٢- هەروەها فێری خۆڕاگری دەبێت: چونکە لە شوانیدا ئاژەڵەکان دێن و دەچن، تۆش دەچیت لەگەڵیاندا و کۆیان دەکەیتەوە و واز ناهێنیت یان ئاژەڵێك نەخۆش دەکەوێت یان دوور دەکەوێتەوە یان لاسارە کەچی شوانەکە خۆڕاگرە.

---

[١]- حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٣٢).

**٣- فێری سۆز و میهرەبانی دەبێت: چونکە تۆ پارێزگاری لە ئاژەڵەکان دەکەیت و خۆشت دەوێن و لە زیان و نەخۆشی و شتدا ئاگاداریان دەبیت، ئەی دەبێت چەندە مرۆڤـەکانت خـۆش بوێت؟! دەبێت ببیتە مایەی کامەرانی مرۆڤەکان.**

**٤- لە شوانیەوە فێر دەبیت خۆت نان و خۆراکی خۆت بەدەست بهێنیت، لای خـەڵك داوا نەکەیت، بەڵکو بتوانیت ئیش بکەیت و بەرهەم بهێنیت، چونکە هەر کەسـە و شـتێکی کـەم بەرهەم بهێنێت، بە هەموویانەوە شتێکی زۆریان دەبێت.**

**٥- هەرچی پێغەمبەرانی تریش هەن کاری شوانیان کردووە، بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) کـە کۆتایی پێغەمبەرانە دەبێت ئەو ئیشە بکات.[١]**

## خوای گەورە پێغەمبەر دەپارێزێت

**کاتێك باپیرەی پێغەمبەر مرد، پێغەمبەر چوو بۆ لای ابـو طـالیبـی مـامی کـە ئـەویش پیاوێکی پیرو لاواز و کەم دەست بوو بۆیە کاری شوانەیی دەکرد.**

**کاتێك پێغەمبەر شوانی دەکرد، هیچ کات بتی نە پەرستوە، بەڵکو لـە شـاخ و دەشـت و بیاباندا بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێ کێ ئەم جیهانە گەورەی بەم جوانیـە دروسـت کردبێـت؟ کێ ئەستێرەکانی ڕاوەستاندوە و ڕووناکی پـێ بەخشـیون؟ کـێ ئـەم مـرۆڤ و ئـاژەڵ و گیـا و درەختانەی بەدی هێناوە؟ پێغەمبەر بیری لەم پرسیارانە دەکردەوە حەزی دەکرد خوا بناسێت، جارێکیان پێغەمبەر لەگەڵ هاورێکەیدا کە سەرقاڵی لەوەڕاندن بوون دەنگی دەهۆڵ و گـۆرانی و شایی بیست لە شاردا، بۆیە داوای لە هاورێکەی کرد تا یارمەتی بـدات ئەمشـەو ئـەو بـە لای ئاژەڵەکانەوە بێت و پێغەمبەر بچێت بۆ ئەو ئاهەنگە و گوێ لە گۆرانی و دەهۆڵ بگرێـت و سەیری شاییەکە بکات، بەڵام کاتێك چـوو خـوای گـەورە پاراسـتی لـەو تاوانـە و وای لـە پێغەمبەر کرد، کە خەوی لێ بکەوێت و ئەو گوناهە نەکات و تا بەیانی بێدار نەبوویەوە.**

**کاتێك شەوی دووەم هات، ویستی دووبارە بچێتەوە کەچی هەندی خوای گەورە پاراستی و خەوی لێ کەوت و گوێی لێ نەگرت سەیری نەکرد تا بەیانی بێدار نەبوویەوە کـە بـەیانی لـە**

[١]- د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٥٥).

خەو هەستا زانی کە ئەوە کارێکی باش نیە گوێ بگرێت لە گۆرانی خراپ و شایەك سەیر بکات کە خراپەی تێدا بێت، بۆیە بڕیاری دا نەچێت بۆ هیچ شایەکی خراپ مەگەر شایەك کە باش و ڕێك و پێك بێت.[1]

پرسیار: گرنگترین وانە و سوودەکانی ئەم باسە بژمێرە

وەڵام: لەم باسی خەو لێکەوتنی پێغەمبەردا ئەم وانانە فێر دەبین:

١- خوای گەورە هەمیشە ئاگاداری ئێمەیە و حەز ناکات خراپە بکەین، بۆیە پێغەمبەری خەواند تا خراپە نەکات و گوێ لە شتی خراپ نەگرێت و سەیری شتی خراپ نەکات.

٢- خوای گەورە پێغەمبەری پاراست، چونکە پێغەمبەر دەبێتە مامۆستای مرۆڤایەتی جا دەبێت کەسێك کە چاکە فێری خەڵکی دەکات، خۆی خراپە نەکات و چاك بێت.

٣- ئەگەر هاوڕێیەکمان ویستی کارێکی خراپ بکات ئەبێت ئێمە نەهێڵین و بە قسەی جوان و بەبێ توڕەیی فێری بکەین کە ئەو کارە خراپە نەکات.

٤- نابێت ئەگەر گەورەکانمان کاری خراپەیان کرد، ئێمەش وەك ئەوان بکەین.

پرسیار: باپیرەی پێغەمبەر کەی مرد و دواتر پێغەمبەر لای کێ بوو؟

وەڵام: باپیرەی پێغەمبەر کاتێك مرد، کە پێغەمبەر (٨) ساڵان بوو دوای ئەویش چوو بۆ لای ئەبو طالیبی مامی کە زۆر پێغەمبەری خۆش دەویست.[2]

---

[1] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٥٣-٥٤).
[2] ـ ابن هشام: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٦٢).

## پێغەمبەر(ﷺ) کاری بازرگانی فێر دەبێت

کاتێك محمد سەرقاڵی شوانی بوو ئەبو طالیبی مامی حەزی کرد محمد فێری ئیشێکی باشتر بکات کە بریتیە لە بازرگانی.

پرسیار: بازرگانی چ سوودێکی هەیە؟

وەڵام: لە کاری بازرگانیدا ئەم سوودانە دەست دەکەوێت:

١- کاری بازرگانی پارە و دەستکەوتێکی زیاتری تێدایە و زۆرتر دەوڵەمەند دەبیت.

٢- لە بازرگانیدا دەچیت بۆ شوێنەکانی تر و خەڵکی تر دەبینیت شارەزایان دەبیت و دەتوانیت چ قسەیەکی باشت پێیە بیکەیت بۆیان.

٣- ئەوشتومەك و پێویستیانەی لە وڵات و شارەکەتدا نین تۆ لە ڕێگەی بازرگانیەوە دەیهێنیت بۆیان چی شتی زیادەش هەیە دەیبەی بۆ شوێنەکانی تر کە ئەو شتەیان نیە، بەوە هەردوو لا یارمەتی یەکتر دەدەن، ئەبو طالیب دەستی پێغەمبەری گرت و لەگەڵ کاروانێکی بازرگانی مەککەدا چوو بەرەو بازرگانی کردن، ئەبو طالیب لە مەککەدا قسەی دەکرد بۆ پێغەمبەر و هەندێ شتی فێر دەکرد و هەمیشە لەگەڵیدا بوو و لێی دوور نەدەکەوتەوە.

کاتێك چوون بۆ لای پیاوێکی مەسیحی کە ناسراو بە بوحەیرا، سەرقاڵی پەرستنی خوای گەورە بوو، بوحەیرا ئەو کاروانە بازرگانیەی بینی بڕیاریدا هەموویان دەعوەت بکات و لای ئەو نان بخۆن و قسەیان لەگەڵدا بکات.[1]

پرسیار: بۆچی بوحەیرا بڕیاریدا دەعوەتیان بکات؟

وەڵام: چونکە کاتێك سەیری کاروانەکەی دەکرد هەر لە دوورەوە بینی کە پەڵە هەورێك بە سەریانەوە سێبەریان بۆ دەکات و لەگەڵیاندا دێت، بوحەیرا سەری لەمە سوڕما و وتی ئەمە ڕووداوێکی سەرسووڕهێنەرە و دەبێت بزانم بۆچی وایە؟ کاتێك کاروانەکە هاتن بوحەیرا هەموویانی دەعوەت کردن نانی بۆ ئامادە کردن بەڵام ئەو بە دوای کەسێکدا دەگەڕا کە لە

[1]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (١٢٢-١٢٨).

ناو ئەواندا ئەبوو ئەو کەسەیش پێغەمبەر بوو بوحەیرا پرسیاری کرد: کەستان ماوە نەهاتبێت بۆ نان خواردن؟ ئەوانیش وتیان کەسمان نەماوە جگە لە منداڵێکی بچووک کە دامان ناوە لەلای ئاژەڵ و شتومەکەکانمان بێت.

بوحەیرا بە پەلە بڕیاریدا ئەو کوڕە ببینێت، کاتێك پێغەمبەری بینی یەکسەر زانی کە ئەو پێغەمبەرە ئەو پێغەمبەرەیە کە خوای گەورە باسی دەکات بۆیە ئەبو طالیبی بانگ کرد و لە پەنایەکدا و بە نهێنی پێی وت: ئەو منداڵە جوان بپارێزە، ئەو لە داهاتوودا دەبێتە گەورەی مرۆڤایەتی، لەگەڵ خۆشتدا مەیبە بۆ ئەم بازرگانیە، چونکە لەوێ ڕۆمەکان دەیناسنەوە و دەیکوژن، بەڵکو بیبەوە بۆ ماڵەوە و بە جوانی ئاگاداری بکە و وریای بە.

ئەبو طالیبیش بە گوێی بوحەیرای کرد و پێغەمبەری بردەوە بۆ ماڵەوە و زیاتر وریای دەبوو،[1] سوودی ئەم ڕووداوە:

١- لەم ڕووداوەوە فێر دەبین دەبێت خۆمان یان برا یان منداڵەکانمان بپارێزین لە دەستی دوژمنانی ئیسلام و نەهێڵین زیانمان پێ بگەیەنن، چونکە ئەوان ڕقیان لە ئێمەیە.

٢- ئەگەر ئێمە چاك بین و ڕاستگۆ بین لەگەڵ خوادا، ئەوا خوای گەورە دەمانپارێزێت.

## پێغەمبەر (ﷺ) فێری جەنگ دەبێت

هۆزەکەی پێغەمبەر، کە هۆزی قورەیش بوو لەگەڵ هۆزێکی تردا کە ناوی (هەوازن) بوو، تاوانی جەنگەکەش لە ئەستۆی هەوەزاندا بوون، واتا خەتاکە هی هەوازن بوو.

لەم جەنگەدا پێغەمبەر بەشداری کرد و، یارمەتی مامەکانی خۆی دەدا و تیری دەدا بە دەستیانەوە، پێغەمبەر لەو کاتەدا (١٥) ساڵان بوو، لەم جەنگەدا پێغەمبەر بەشداری کرد و هەوڵی خۆی دا و کۆمەڵێك شتی زۆر فێر بوو لە بارەی جەنگەوە.[2]

چی تێگەیشتی لە ڕووداوی ئەم جەنگەدا؟

---

[1] - عەبدولعەزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (٧٣-٧٤).

[2] - محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٤٦).

١- تێگەیشتم ئەگەر جەنگ لە نێوان دوو لادا کرا دەبێت من لایەنی حەق و ڕاستەکە هەڵبژێرم، ئایا خزمەکانی خۆم بێت یان بێگانە بێت، ئەگەر دوو کەس جەنگیان کرد کامەیان ڕاست و حەق بوون پشتگیری ئەوەیان دەکەم.

٢- جەنگ مرۆڤەکان فێری نەترسی و ئازایەتی دەکات، تۆڵەسەندنەوەیە لە ستەمکاران.

٣- لە جەنگدا دەبێت گوێڕایەڵی گەورەتر لە خۆت بیت و لە خۆتەوە هەموو شتێك نەکەیت.

## هاوپەیمانێتی (فضول)

پاش ئەوەی پێغەمبەر لە جەنگی (فوجار)دا فێری جەنگ بوو، خوای گەورە ویستی وانەیەکی تری فێر بکات، ئەویش ئەوە بوو کە گەورەی هۆزەکان کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی یەك بگرن بۆ پشتگیری کردنی ستەم لێکراوان و هەژاران، هەروەها پێکەوە دژایەتی ستەم کاران بکەن، لەم هاوپەیمانێتیەدا پێغەمبەریش بەشدار بوو.[1]

لەمەوە فێر دەبین کە:

١- پێویستە دژایەتی ستەمکار بکەین و پاڵپشتی هەژاران و بێکەسان بین.

٢- هەر کارێك سوودی خەڵکی تێدابێت و خراپ نەبێت، ئێمەیش تێیدا بەشدار بین.

٣- خوای گەورە ستەمکاری خۆش ناوێت، بۆیە دەبێت ئێمەش خۆشمان نەوێت.

پرسیار:

١- ئایا تا ئێستا هەوڵت داوە یارمەتی هەژار و ستەم لێکراوێك بدەیت؟

٢- ئایا لە دەوروبەرتدا کەسی ستەمکارت دیوە؟

٣- چ کارێك بکەیت باشە بۆ ئەوەی نەهێڵیت ستەمت لێ بکرێت؟

---

[1]- ابن کثیر، البدایة والنهایة، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، لاپەڕە (٣٣٢-٣٣٥).

بەڵێ منداڵانی نازیز، هەمیشە ستەمکار دەبێتە مایەی لەناوبردنی ژیانی ئاسایی و کامەرانی، ئەگەر هاتوو ئێمە لەسەری بێدەنگ بین و هەوڵ نەدەین ستەمکار بشکێنین، ئەوا کەسی ستەمکار زاڵ دەبێت بە سەرماندا و بە پێی ئارەزووی خۆی چی دەوێت دەیکات، ستەمکار ماڵی خەڵك دەبات، منداڵان دەکوژێت و خانووەکان وێران دەکات و شت گران دەکات و پیاوان دەکوژێت و یان لێیان دەدات، بەڵام ئەگەر هەموومان پێکەوە لە دژی ڕابوەستین، ئەو کات هیچی پێ ناکرێت و ئێمەش ڕزگارمان دەبێت.

## بازرگانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەدیجە

پێغەمبەر کوڕێکی گەنج و ڕێك و پێك بوو، ئەو ڕاستگۆ و دەستپاك بوو، خەڵکی بە (صادق الامین) ڕاستگۆی دەستپاك بانگیان دەکرد، هەرچی خەڵك بوو خۆشیان دەویست و متمانەیان پێی بوو، خەدیجە کە کچی خوەیلید بوو، خزمی پێغەمبەر بوو ئەو ژنە پێشتر شووی کردبوو، بەڵام ئێستا بێ مێردە و ماڵ و سامانێکی زۆری بۆ ماوەتەوە، خەدیجە کە بیستبووی پێغەمبەر بەو جۆرە دەست پاك و ڕاستگۆیە و خەڵکی متمانەیان پێی هەیە، داوای لە پێغەمبەر کرد تا کاری بازرگانی بۆ بکات و لە بەرامبەردا بڕێك پارە بدات بە پێغەمبەر.

پێغەمبەریش بەمە ڕازی بوو کە ئەو کاتە کاری بازرگانی دەکرد بۆ خەدیجە ئەو هەر دەم دەست پاك بوو لە کارەکەیدا بۆ خەدیجە و هەوڵی دەدا زیانمەند نەبێت لە کارەکەیدا، بەم جۆرە بەردەوام لە قازانج کردندا بوو.[١]

## پەند و ئامۆژگاری

١- دەبێت ئێمەی موسڵمان بەتاڵ نەبین و کار بکەین، ئیتر هەر ئیشێك بێت بەڵام دەبێت ئیشەکە سوودمەند بێت نەوەك ئیشێکی حەرام و خراپ.

[١]- د.علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٢).

٢- ئەگەر ڕاستگۆ و دەست پاك بین، خەڵك متمانەی هەبێت پێمان، ئەو كات كارمان بۆ دەبێت و خەڵك حەز دەكات ئیشی بۆ بكەین چونكە درۆی لەگەڵدا ناكەین.

٣- ئیشكردن بۆ ژن بێت یان بۆ پیاو دەبێت بە شێوازێكی ڕێك و پێك بێت.

پرسیار: بۆچی خەدیجە پێغەمبەری هەڵبژارد بۆ كاری بازرگانی؟

وەڵام: چونكە:

١- پێغەمبەر پێشتر شارەزای كاری بازرگانی بووبوو.

٢- پێغەمبەر دەست پاك و ڕاستگۆ بوو، بەڵام خەڵكی تر بە گشتی ناپاك بوون.

٣- پێغەمبەر كوڕێكی گەنج بوو دەیتوانی بە باشی ئیشەكان ببات بە ڕێوە.

٤- خوای گەورە وای كرد لە خەدیجە ئەو كارە تا ژیانی پێغەمبەر خۆش بێت، پێغەمبەر ماوەیەكی زۆر ئەو ئیشەی دەكرد بۆ خەدیجە و هیچ ناپاكیەكی لەگەڵدا نەنواند، بۆیە خەدیجە بڕیارێكی تازەی دا بۆ پێغەمبەر.

## *ژن هێنانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەو بڕیارە تازەیەی كە خەدیجە دای بۆ پێغەمبەر، ئەوە بوو داوای لە پێغەمبەر كرد تا ببێتە هاوسەری ژیانی و بێتە داوای خەدیجە، كاتێك پێغەمبەر ئەمەی بیست، داواكەی خەدیجەی قبووڵ كرد و بڕیاریدا بچێتە داوای، بۆ ئەمەش خزمان و نزیكانی خۆی نارد بۆ ئەو كارە.

بەڵام باوكی خەدیجە ڕازی نەبوو بەو كارە و حەزی دەكرد خەدیجە شووی پێ نەكات، چونكە ئەو دەیووت پێغەمبەر دایك و باوكی نیە و، هەروەها دەیوت پێغەمبەر كوڕێكی هەژارە و ماڵ و، سامانی زۆری نیە وەك خەدیجە بەڵام خەدیجە ،بە هەر چۆن بێت باوكی خۆی ڕازی كرد و، پێغەمبەر لە تەمەنی٢٥ ساڵیدا خەدیجەی هێنا كە تەمەنی خەدیجە لە تەمەنی پێغەمبەر زیاتر بوو.[1]

[1]ـ محمد مەلا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لاپەڕە (٣٧-٣٩).

هەندێك دەڵێن خەدیجە ٢٩ ساڵ بووە و هەندێکیش دەڵێن ٤٠ ساڵ بووە.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر داواکەی خەدیجەی قبووڵ کرد؟

وەڵام: چونکە خەدیجە:

١- ژنێکی زیرەك و تێگەیشتوو بوو و لە ژیاندا ناقڵانە دەژیا.

٢- خەدیجە ژنێکی رێك و پێك و بە رەوشت بوو کە ئەمەش لای پێغەمبەر گرنگ بوو.

٣- خەدیجە لە بواری دارایییەوە یارمەتی پێغەمبەری دابوو بەوەی هەڵیبژارد بۆ کاری بازرگانی ئاکار و رەفتاری جوان وا دەکات کە هەمیشە ئێمە لەلای خەڵکی ژیر و عاقڵ و خۆشەویست بین و رێزمان بگرن، بەڵێ... دەبێت کەسانی نەفام و بێ عەقڵیش رێزمان نەگرن و بە شێوازێکی کەم سەیرمان بکەن، وەك چۆن باوکی خەدیجە نەفامانە پێغەمبەری بە دڵ نەبوو تا ببێتە هاوسەری کچەکەی، بەڵام کەسانی ژیر و تێگەیشتووی وەك خەدیجە دەزانن کێیان خۆش بوێت!

خەدیجە و پێغەمبەر بە خۆشی و کامەرانی ژیانیان بەسەر دەبرد و یەکتریان خۆش دەویست، ئەوان لە کارەکانیاندا راوێژیان دەکرد بە یەکتر و گوێیان دەگرت لە قسەی یەکتر، شەڕ و ناخۆشی نەبوو لە نێوانیاندا و رێزی یەکتریان دەگرت، چونکە ئەگەر مرۆڤەکان ژیر و عاقڵ بن پێکەوە دەگونجێن و لە یەکتر تێدەگەن، بەڵام ئەوانەی تەنها پارە و دونیا و سەیارە و شتیان دەوێت، دواتر لەسەر شتی بچووکتر دەیکەن بە ناخۆشی، چونکە ئەوان عەقڵ و ژیری و خۆشەویستیان هەڵنەبژاردووە.

## پێغەمبەر و خەدیجە چەند منداڵێکیان دەبێت کە ئەمانەن:

١- کوڕەکانی کە ناویان: قاسم و عبداللە بوو، ئەم دوانە هەر بە منداڵی مـردن، کاتێـك مردن پێغەمبەر (ﷺ) دەیگرتنە باوەش و فرمێسکی دەڕژاند بۆیان و دەگریـا بۆیـان، ئـاخۆ باوك منداڵی زۆر خۆش دەوێت، زیاتر لەوەی منداڵ باوکی خۆش دەوێت.

٢- کچەکانی کە ناویان: زەینەب و ڕوقیە و ام کلثوم و فاطمة بـوو، کچـەکانی مانـەوەو موسڵمان بوون و کۆچیان کرد بۆ مەدینە و شوویان کرد و بە ڕێك و پێکی ژیان.[1]

## *گرنگترین پەندەکانی ئەم باسە

١- مردن لە ڕێگەی هەمووماندایە و گەورە و بچووکی لا نیە، کاتێـك مـردن هـات بـیر لەوە ناکاتەوە کە ئەمە بچووکە و ئەوە پیرە، بەڵکو کێ نـاوی نووسـرابێت بـۆ مـردن دەبێـت بمرێت و تاکە ساتێك پاش و پێشی نیە لە مەرگدا، وەك دەبیـنین پێغەمبـەر کـە بـە تەمەنـە نامرێت کەچی کوڕەکانی کە بچووکن دەمرن.

٢- گریان بۆ مردووەکانمان شتێکی ئاساییە، هەر کەسێك نزیکێکی بمرێت و خۆشی بوێـت بۆی دەگری، بەڵام نابێت گریانەکە وا بێت دەنگی بەرز بێتەوە و قیژ و قاژ بکات و بـدات لـە خۆی، چونکە خوا ڕقیەتی لەو کارە ناپەسەندە.

دووبارە دەبینین پێغەمبەر کەسانێکی تری دەمرن کە کوڕە خۆشەویستەکانی بوون، پێشـتر یەکەمجار باوکی مرد و پاشان دایکی مرد ئنجـا بـاپیری مـرد ئێسـتاش کوڕەکـانی دەمـرن و بەجێی دەهێڵن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ڕادەگرێت و ڕازیە بە ئیشی خوای گەورە.

پرسیار: ئەی خەدیجە چی کرد بە مردنی کوڕەکانی؟

وەڵام: خەدیجەش لە پێغەمـبەری مێردیەوە فێری خۆڕاگری و ڕەوشت بەرزی بووبوو کارێکی ناڕەوا و ناشیرینی وای نەکرد کە ببێتـە مایـەی نـابڕوو چـوونی، پێویسـتە ئێمـەیش ئەگـەر کەسێکی نزیکمان مرد بەدەنگی نزم بۆ خۆمان بگرین، نەوەك هـاوار و قـاو و قیـژ بکـەین و

---

[1] ـ د.علی محمد الصلابی: السيرة النبوية، لاپەڕە (٦٢-٦٣).

دەنگمان دنیا بگرێتەوە و خۆمان بکێشین بە خاکدا و بدەین لە خۆمان، چونکە ئەوە ڕەفتاری موسڵمان نیە و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ئەو کارەی نەکردووە و خوایش پێی ڕازی نیە.

## بنیادنانەوەی کەعبە

کەعبە ئەوماڵەیە لە شاری مەککەدا کە ئێمەی موسڵمان لە هەموو لایەکی جیهانەوە ڕووی تێ دەکەین و کڕنووش دەبەین بۆ خوا بەرەو ڕووی ئەو ماڵە، ئەو ماڵە ماڵی خوای گەورەیە، بەڵام وا تێنەگەین خوا لەو ماڵەیە، بەڵکو خوای گەورە لە هەموو شوێنێکیدا ئاگای لە ئێمەیە.

کاتێك پێغەمبەر گەیشتە تەمەنی ٣٥ ساڵ، خەڵکی مەککە ویستیان کەعبە بڕوخێنن و هەمتر بە جوانی و سەر لە نوێ دروستی بکەنەوە، بەڵام خەڵکەکە ترسیان هەبوو لەوەی بیڕوخێنن و دەیانوت ئەگەر بێتوو ئێمە کەعبە بڕوخێنین ئەوا خوای گەورە لە ناومان دەبات و ڕوومان ڕەش دەکات، یەکێك لەوانە ناوی (وەلیدی کوڕی موغیرە) بوو، وتی من دەست دەکەم بە ڕووخاندنی کەعبە، خۆ ئێمە دەمانەوێت هەمتر بە تازەیی دروستی بکەینەوە، نامانەوێت بیڕوخێنین و وازی لێ بێنین، ئینجا وەلید کەوتە ڕووخانی کەعبە و هەموان چاوەڕێ بوون، ئەگەر خوا وەلید لە ناو ببات ئەوا دەستکاری کەعبە ناکەن، بەڵام ئەگەر خوا هیچی لێ نەکرد، ئەوا ئەوانیش دەست دەکەن بە ڕووخاندنی کەعبە و دوایی پێکەوە دروستی دەکەنەوە، خوای گەورە هیچی نەکرد بە وەلید و خەڵکەکەش خۆشی دایگرتن و کەوتنە ڕووخانی کەعبە و سەر لە نوێ دروستیان کردەوە، هەموو هۆزو خێڵەکان لەم کارەدا بەشداریان کرد، ئەو کات هاتە سەر بەردە ڕەشەکە، هەموو هۆزێك دەیوت دەبێت من بەردە ڕەشەکە بخەمەوە شوێنی خۆی خەریك بوو لەسەر ئەمە جەنگ بەرپا دەبوو لە نێوانیاندا، دواتر کەوتنە قسەکردن و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هەر کەس بێت بۆ لایان بیکەن بە دەمڕاست و دادوەری ئەو کێشەیە تا ئەو چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، هەموو سەیریان دەکرد تا بزانن کێ یەکەم کەس دێت بۆ لایان، کاتێك سەیریان کرد لە دوورەوە کەسێك دێت، کە لێی ورد بوونەوە دیتیان(محمد)ە، هەموویان ڕازی بوون و وتیان(محمد) ڕاستگۆ و دەست پاکە و ئێمە ڕازین ئەو ببێتە دادوەر لە نێوانماندا تا ئەم کێشەیەمان چارەسەر بکات، کاتێك

باسی کێشەکەیان کرد بۆ (محمد) و داوایان کرد قسەی لەسەر بکات، پێغەمبەر عەباکەی خۆی هێنا و ڕای خست و بەردەکەی خستە سەر عەباکە، پاشان داوای کرد هەر هۆزێك لایەکی عەباکە بگرن و بەرزی بکەنەوە و خۆیشی لە سەرەوە بەردە ڕەشەکەی گرت و خستیەوە شوێنی خۆی و کێشەکەی چارەسەر کرد.[1]

پرسیار: بۆچی بەردە ڕەشەکە ئەوەندە گرنگ بوو لایان؟

وەڵام: چونکە ئەو بەردە ڕەشە بەردی بەهەشت بووە و پێغەمبەر ئادەم (علیه السلام) کاتێك هاتۆتە سەر زەوی ئەو بەردەی هێناوە لەگەڵ خۆیدا، بەردەکە یەکجار زۆر سپی بووە، بەڵام دوایی بە هۆی گوناه و تاوانی خەڵکەوە ڕەش بووەتەوە، کاتێ دەچیت بۆ حەجی ماڵی خوا، دەبێت ئەو بەردە ڕەشە ماچ بکەیت.

* پەند و ئامۆژگاریەکان:

١- ئەگەر ویستمان ئیشێکی چاك بکەین با نەترسین، چونکە خوای گەورە پێی خۆشە ئێمەی بەندەی خوا ئیشی باش بکەین و حەز ناکات خراپەکاری بکەین.

٢- ئێمە دەبێت هەموو شتێکمان لەبەر خاتری خوا خۆش بوێت، ئەو بەردە ڕەشە ئەگەر لەبەر خاتری خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نەبێت ئێمە وەك بەردی تر سەیری دەکەین، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشی ویستووە و ماچی کردووە، بۆیە ئێمەیش خۆشمان دەوێت و ماچی دەکەین، دوای ئەم ڕووداوە جۆربەجۆرانە، بەرەبەرە پەیامی خوایی خۆی دەنواند بۆ پێغەمبەر و هەواڵیان پێ دەدا کە تۆی ئەی پێغەمبەر بەم زووانە دەبیتە پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتی و دەبێت پەیام و فەرمایشی خوای گەورەیان پێ بگەیەنیت، لەم کارەیشدا نابێت واز بهێنین و خوا ئاگاداری تۆیە و بەڵێن بێت سەرت بخەین، بەڵێ لەمەودوا دەچینە سەر ژیانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و لە جیاتی ناوی (محمد) دەڵێین: پێغەمبەری ئازیزمان محمد(ﷺ).

[1] محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٤٧).

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

١- پێغەمبەر ناوی خۆی و باوك و دایکی چیە؟ لە کام ڕۆژدا لە دایك بووە.

٢- بۆچی خوای گەورە هەر بەمنداڵی دایکی پێغەمبەری مراندو خوشك و برای نەدا بەپێغەمبەر؟

٣- پێغەمبەر دوای دایکی لە لای کێ بوو؟ سەرقاڵی چی بوو؟

٤- گرنگترین ڕەوشتەکانی پێغەمبەر بژمێرە لە منداڵیدا.

٥- پێغەمبەر چۆن فێری شوانی بوو؟ سوودی شوانی چی بوو؟

٦- پێغەمبەر چۆن فێری بازرگانی بوو؟ سوودی بازرگانی چی بوو؟

٧- پێغەمبەر چۆن فێری جەنگ بوو؟ چ سوودێکی لێ وەرگرت؟

٨- پێغەمبەر لە کام هاوپەیمانێتیدا بەشداری کرد و بۆچی ئەو هاوپەیمانێتیە بەسترا؟

٩- خەڵکی مەککە سەرقاڵی چ کاروبارێك بوون؟

١٠- خێزانی پێغەمبەر ناوی چی بوو و چۆن هێنای؟

١١- بوحەیرا کێ بوو؟ چ سوودێکی هەبوو بۆ پێغەمبەر؟

١٢- بۆچی پێغەمبەر بە منداڵی نێردرا بۆ لادێ؟

١٣- بۆچی خەدیجە پێغەمبەری هەڵبژارد بۆ کاری بازرگانی کردن؟

١٤- ناوی منداڵەکانی پێغەمبەر بژمێرە و دواتر چییان بەسەر هات؟

١٥- پێغەمبەر لە چ تەمەنێکدا ژنی هێنا؟ دەتوانیت باسی ژن هێنانەکەی بکەیت؟

١٦- کەعبە کوێیە؟ موسڵمانان بۆچی خۆشیان دەوێت؟ کێ دروستی کرد؟

١٧- بۆچی خەڵکی مەککە ویستیان کەعبە بڕوخێنن؟

١٨- پێغەمبەر چۆن چارەسەری کێشەکەی نێوان خەڵکی مەککەی کرد لەسەر بەردە ڕەشەکە؟

١٩- ئەبرەهە کێ بوو؟ ویستی چی بکات؟ خوای گەورە چی پێ کرد؟

٢٠- کێ شیری دەدا بە پێغەمبەر؟ دوایی چی کرد بە پێغەمبەر؟

# بەشی دووەم

## دابەزینی سروش (وەحی) بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

پێغەمبەر محمد(ﷺ) ماوەیەك پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، چەند جۆرە گۆڕانێکی بینی لە ژیانی خۆیدا، کە ئەوانە ئاماژەی پێشتر بوون بۆ پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ).

یەکەمجار خەو بینین بوو، پێغەمبەر(ﷺ) خەوی دەبینی و خەوەکەی بەڕاست و دروست دەهاتە دی و هیچ جۆرە ناڕاستیەکی تێدا نەبوو، دواتر پێغەمبەر حەزی دەکرد ماوەیەك بە تەنها بێت و لە چۆڵەوانیدا بژیت، بۆ ئەوەش لە ساڵێکدا مانگێك دەچوو بۆ ئەشکەوتێکی دەوروبەری مەککە پێی دەوترا ئەشکەوتی (حراء)،[1] پێغەمبەر(ﷺ) لەوێدا بیری لەوە دەکردەوە کە ناکرێت ئەم دنیا و ژیانە هەر وا بڕوات بە ڕێوە و گەورە و دروستکەر و سەرپەرشتکارێکی نەبێت، بەڵێ پێغەمبەر بە دوای خوادا دەگەڕا، کاتێك پێغەمبەر تەمەنی چل ساڵان بوو، لە مانگی ڕەمەزاندا چوو بۆ ئەشکەوتی حراء.

لەوێ کەوتە ڕاز و نیاز و بیر کردنەوە، ئەشکەوتێك دوور لە شار بوو، چۆڵ بوو کەسی تێدا نەبوو، ئەشکەوتەکە تاریك بوو چونکە شەو داهاتبوو دنیا تاریکی کردبوو.

لەو کاتەدا فریشتەیەکی خوا هات و بەوپەڕی توندی باوەشی کرد بە پێغەمبەردا و پێغەمبەری گوشی، خەریك بوو پێغەمبەر ئێسکەکانی بشکێت هێندە توند فریشتەکە گرتبوویە خۆ، پێغەمبەر(ﷺ) تەواو ترس و بیم دایگرت و نەیدەزانی چی بکات و دەستەوسان وەستابوو.[2]

فریشتەکە پێی وت بخوێنە (إقرأ)، پێغەمبەر فەرمووی: من خوێندەوار نیم و نازانم بخوێنم، ئاخۆ پێغەمبەر فێری خوێندن نەکرابوو، فریشتەکە دووبارەی کردەوە (بخوێنە) و پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان وەڵامی دانەوە، تا سێ جار ئەم شتە دووبارە بوویەوە ئەو کات

---

[1] ـ ابن اسحاق، الاسیرة النبویة: لاپەڕە (١٦٨).
[2] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (١٠٧).

فریشتەکە ئەم ئایەتەی قورئانی بەسەردا خوێندەوە و فێری کرد ﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق﴾.[١]
واتا: بە ناوی ئەو پەروەردگارەوە بخوێنە کە دروستی کردووی و خوڵقێنەرە.

ئینجا فریشتەکە بە پێغەمبەری ڕاگەیاند کە خوای گەورە تۆی کردووە بە پێغەمبەر و دەبێت پەیامی خوا بگەیەنیت بە مرۆڤایەتی.[٢]

پرسیار: ئەو فریشتەی هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو فریشتەیە ناوی (جوبرەئیل) بوو کە چووە بۆ لای هەموو پێغەمبەرانی تر و پەیامی خوای گەورەی گەیاندووە پێیان.[٣]

پرسیار: یەکەم ئایەتی قورئانی کە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) کام ئایەت بوو؟

وەڵام: یەکەم ئایەت ئایەتی ﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق﴾ بوو.

*** پەند و ئامۆژگاری:**

١- پێویستە موسڵمان هەمیشە بیری خوای گەورە بکاتەوە و جارجارێك بە تەنها دابنیشێت و سوپاسی خوا بکات و لە خوای گەورە بپاڕێتەوە.

٢- ئەرکی سەر شانمانە وەك چۆن نوێژ دەکەین، بەو جۆرەیش زانست فێر بین، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین فێری زانست ببین، بۆیە هەر کەس خۆی فێری زانست نەکات ئەوا بە گوێڕایەڵی خوای نەکردووە.

٣- خوای گەورە هەمیشە ئاگاداری ئێمەیە و قسەی خۆی دەنێرێت بۆمان(قورئانی پیرۆز).

٤- پێویستە هەرچی زانستێکمان وەرگرت، فێری خەڵکی تری بکەین، تا بە گوێی فەرمایشتی خوا بکەن و نەهێڵین خەڵك نەزان و نەخوێندەوار بن.

[١] ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٥٩).
[٢] ـ د. حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٦٨).
[٣] ـ ابن هشام، السيرە النبويە، لاپەڕە (٢١٦).

٥- هەر کەس فێری زانست ببێت، ئەوا فەرمانی خوای گەورەی بە جێهێناوەو، بەهەشت شوێنیەتی، بەڵام بە مەرجێك زانستێکی چاك وەربگرێت و لە قسەی خوا لانەدات.

پرسیار: ئەی دوای ئەو ڕووداوە پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟

وەڵام: دوای ئەو ڕووداوە پێغەمبەر (ﷺ) بە پەلە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و چـوویە ژوورەوە و زۆر ترسابوو، داوای کرد لە خەدیجەی خێزانی کە بەتانی بـدات بـە سـەریدا و دای بپۆشـێت، چونکە پێغەمبـەر گیـان(ﷺ) لـەرز و تـا دایگرتبـوو وای دەزانـی ئـەو ڕووداوە زیـانی پـێ دەگەیەنێت ،خەدیجەش بە گوێی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد و دای پۆشی و دڵنـەوایی پێغەمبـەری دەدایەوە و پێی دەوت تۆ هیچ زیانت لێ ناکەوێت چونکە تۆ میهرەبان و ڕووخۆش و بەسۆز و بە ڕەحم بوویت لەگەڵ خەڵکدا و خراپەت نەبووە.[1]

دواتر کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەك لە ناو جێگەدا کەوت، خەدیجە بە پەلە چوو بـۆ لای ئامۆزایەکی کە ناوی (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) بـوو، لـەوێ بـاس و خواسـەکەی باسـکرد بـۆ وەرەقە، ئەویش بە خەدیجەی وت مەترسە و بڕۆ پێغەمبەر بێنە بۆ لام با قسەی لەگەڵدا بکەم و لە نزیکەوە بیبینم، خەدیجەش بڕیاریدا پێغەمبـەر(ﷺ) ببـات بـۆ لای وەرەقـە و پێکـەوە چوون بۆ لای، لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) باس و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، وەرەقەیش پێی وت کـە تۆ بوویت بە پێغەمبەری خوا و ترست نەبێت، ئەو فریشتەیەش لە لای خواوە هاتووە بۆ لات، دەبێت تۆ لەمەودوا خەڵك بانگ بکەیت بۆ لای ئاینی خوا و فێری ئیسلامیان بکەیت، بـەڵام خەڵکی لـە دژت ڕادەوەسـتن و ڕقیـان دەکـەوێت لێـت، بۆیـە دەبێـت خـۆت ڕابگریـت و واز نەهێنیت تا ئەو کاتەی سەردەکەویت، پێغەمبـەر(ﷺ) سـەری سـوڕما لـەو قسـەیە، بـەڵام باوەڕی پێی هەبوو و لەگەڵ خەدیجەدا گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بڕیاریدا دەست پێ بکات.[2]

پرسیار: بۆچی خەدیجە وەرەقەی هەڵبژارد تا پێغەمبەر(ﷺ) ببات بۆ لای؟

وەڵام: چونکە وەرەقە کەسێکی خوێندەوارو زیرەك بوو، ئەو شارەزای ئاینـەکانی تـر بـوو، دەیزانی لە ئاینەکانی تر چۆن باسی پێغەمبەرایەتی کراوە.

---

[1]ـ ابن الاثیر: الکامل في التأریخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٦٤٨).
[2]ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣-٤).

پرسیار: بۆچی خەڵك رقیان دەكەوێت لە پێغەمبەر(ﷺ) كەچی پێشتر خۆشیان دەویست؟

وەڵام: چونكە كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئیسلامیان بۆ بكات، شەیتان خەڵكەكە هان دەدات تا رقیان لێ بكەوێت، هەروەها خەڵكەكە حەزیان لە كاری خراپە و پیسی و بەدرەفتاری بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموون كە لە جیاتی خراپە چاكە بكەن، بۆیە رقیان كەوت لە پێغەمبەر(ﷺ).

*** پەند و ئامۆژگاری:**

١- هەر كارێكمان كرد رووداوێك روویدا دەبێت راوێژ بكەین بە كەسانی دۆست و ژیرو خۆشەویستمان وەك دایك و باوك و مامە و خاڵ و پوور و خوشك و برا و ژن و كەسانی تری باش، وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) قسەی كرد بۆ خەدیجەی خێزانی و ئاگاداری كردەوە لە رووداوەكە.

٢- دەبێت كارە گرنگ و رووداوە گرنگەكانمان لای هەموو كەسێك باس نەكەین و بزانین كێ شارەزایە بچین بۆ لای ئەو وەك چۆن خەدیجە چوو بۆ لای وەرەقەی كوری نەوفەل كە كەسێكی شارەزا و زانا بوو لەو بوارەدا.

٣- كاتێك دەمانەوێت كێشە و گرفتێك چارەسەر بكەین، دەبێت بە وردی و بە جوانی رووداوەكە باس بكەین و درۆی تێدا نەكەین تا كەسی شارەزا بزانن رووداوەكە چۆن بووە و چارەسەری دروستمان بۆ بڵێن.

٤- ئەگەر خەڵكی لەسەر ئاینی ئیسلام رقی لێمان كەوت و دژایەتی كردین نابێت ئێمە بترسین و واز بهێنین، چونكە ئێمە خوای گەورە یارمەتیمان دەدات.

پرسیار: ئایا وەرەقەی كوری نەوفەل خۆی موسڵمان بوو؟

وەڵام: بەڵێ وەرەقەی كوری نەوفەل كەسێكی چاك بوو پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرموێت وەرەقە لە بەهەشتدایە و قسەی پێ نەڵێن.[1]

[1]- د. علی محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەرە (٨١).

٥- ئەگەر تووشی ڕووداوێك بووین و ترساین، نابێت بەردەوام لە جێگەدا بکەوین و لە ماڵەوە نەیەینە دەرەوە و بەردەوام بترسین، وەك چۆن دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوە لە جێگەدا هاتە دەرەوە و ترسی نەما و دەهات و دەچوو قسەی دەکرد بۆ خەڵك و هەوڵی دەدا باسی ئیسلامیان بۆ بکات، خوای گەورە دواتر ئایەتی تری دابەزاند بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: ﴿يأيها المدثر قم فأنذر﴾، ئەی ئەوەی خۆت داپۆشیوە و لە جێگەدایت هەستە و خەڵکی بێدار بکەرەوە و ئاینی ئیسلامیان پێ گەیەنە.

## پەند و ئامۆژگاری

خوای گەورە هەموو جارێك ئایەتی دادەبەزاند بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) تا پێغەمبەر(ﷺ) فێر بکات کە خوای گەورە ئەو لە بیر ناکات و هەمیشە ئاگای لێیەتی، هەروەها بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام ئاینی خوا بگەیەنێت بەو خەلکە و نەوەستێت، بۆیە دەبێت ئێمەیش وەك پێغەمبەر (ﷺ) بکەین و بەردەوام زانست وەربگرین و قورئان بخوێنینەوە و لای مامۆستاکەمان واتای فێر ببین و بە گوێی قورئان بکەین دوایش خەڵکی تر فێر بکەین بە تایبەت خزمانی خۆمان.

## بانگەواز بە نهێنی

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە بانگەواز بە نهێنی بۆ ئاینی ئیسلام.

پرسیار: بانگەوازی نهێنی واتای چیە و چەندێك بەردەوام بوو؟

وەڵام: بانگەوازی نهێنی واتا بانگکردنی خەڵك بە نهێنی بۆ ئاینی ئیسلام، واتا متمانەت بە کێ بوو، بچیت بۆ لای و بە نهێنی کە کەس پێتان نەزانێت باسی ئاینی ئیسلامی بۆ بکەیت تا موسڵمان بێت، ئەم بانگەوازە نزیکەی سێ ساڵی خایاند.[1]

## موسڵمان بوونی ماڵی پێغەمبەر (ﷺ)

لە ماڵی پێغەمبەردا(ﷺ) خەدیجەی خێزانی یەکەم کەس بوو لە نێو ئافرەتاندا کە موسڵمان بوو، خەدیجە کاتێك ڕاستگۆی و دەست پاکی پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی هەروەها

[1] ـ محمد سعيد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، لاپەڕە (٦٨).

بەهۆی خۆشەویستی زۆری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باوەڕی هێنا بەئاینی ئیسلام و موسڵمان بوو، پاشان کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەك یەك موسڵمان بوون بەو هۆکارەی ئاکاری جوان و هەڵوێستی بڵندی ئایینداری دایك و باوکی خۆیان دەبینی و ڕازی بوون لێیان.[1]

## پەند و ئامۆژگاری

١- پێویستە ئاکار و ڕەفتارمان هێندە جوان و بڵند بێت، هەمووان ڕازی بن بە ڕەفتارمان، بە تایبەت ماڵەوەمان و خزمانمان تا بە هۆی ئەو ڕەفتارە جوانانەمانەوە لەئاینی ئیسلام تێبگەن و ئەوانیش وەك ئێمە بکەن.

٢- پێویستە کەسی موسڵمان پێش ئەوەی قسەی چاك و خێر بکات بۆ خەڵکی تر و یارمەتیان بدات، دەبێت یارمەتی ماڵەوەی خۆی و نزیکەکانی بدات و قسەی چاکیان بۆ بکات، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) یەکەمجار ماڵەکەی خۆی فێر کرد.

## موسڵمانبونی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)

پرسیار: عەلی کێ بوو؟ چ پەیوەندیەکی هەبوو بە پێغەمبەرەوە؟

وەڵام: عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو، ئەو ئامۆزای پێغەمبەر (ﷺ) بوو، کەسێکی کەم تەمەن بوو، واتا منداڵ بوو، لەبەر ئەوەی ئەبو تالیب پیر بوو نەیدەتوانی سەرپەرشتی منداڵەکانی خۆی بکات، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) عەلی هێنایە لای خۆی و ئەرکی بەخێوکردن و سەرپەرشتی کردنی گرتە ئەستۆی خۆی،[2] عەلی کاتێك زانی بە ئاینی ئیسلام، یەکسەر موسڵمان بوو[3] بۆیە یەکەم منداڵ کە موسڵمان بوو عەلی بوو.

---

[1]ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٨٦-٨٧).

[2]ـ عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەری، لاپەڕە (٦٦).

[3]ـ د. حامد احمد الطاهر: حیاة الصحابة للاطفال، لاپەڕە(٨٢).

## پەند و ئامۆژگاری

١- پێویستە ئێمەیش وەك پێغەمبەر(ﷺ)بەوەفا بین بەرامبەر بە خزم و کەسەکانمان و ئەگەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردین، ئێمەیش هەوڵ بدەین چاکەی لەگەڵدا بکەینەوە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) چاکەی کردەوە لەگەڵ ئەبو تالیبی مامیدا.

٢- موسڵمان بوون بە گەورەیی و بچووکی نیە، بەڵکو بەوەیە کێ زووتر موسڵمان دەبێت، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش کە موسڵمان بوو لە پێش زۆربەی زۆری گەورەکانەوە موسڵمان بوو، منداڵانی نازیزیش دەبێت بزانن کە تەنها پیاوە گەورەکان کاری چاکە ناکەن، بەڵکو ئەمڕۆیش منداڵان دەتوانن یارمەتی دەوروبەر بدەن و کاری چاکە بکەن و پێش گەورەکان بکەون.

٣- پێویستە یارمەتی خزمەکانمان بدەین و چی کارێکی چاکمان پێ دەکرێت بۆیان بکەین، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتی خزمەکانی خۆی دەدا و سەردانی دەکردن.

پرسیار: ئایا ئەبو تالیبی باوکی عەلی کە مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو موسڵمان بوو؟

وەڵام: نەخێر ئەبو تالیب موسڵمان نەبوو، بەڵام پشتگیری پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد.

## موسڵمانبوونی (ئەبو بەکری صدیق)

ئەبو بەکر هاوڕێی گیانی بە گیانی و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئەو هەر لە سەرەتاوە کەسێکی ڕێك و پێك و بە ئاگا بوو و حەزی بە هاوڕێیەتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەبو بەکر کەسێکی ناسراوی مەککە و دەوڵەمەندیش بوو، کاتێك ئەبو بەکر هەواڵی ئەوەی بیست کە ئاینی ئیسلام دابەزیوە، یەکسەر موسڵمان بوو، بوو بە یەکێك لەو کەسانەی کە بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام چەندین کەس لەسەر دەستی ئەبو بەکر موسڵمان بوون، لە نێو گەورە و پیاوەکاندا ئەبو بەکر یەکەم کەس بوو کە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

[1]ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٠).

پرسیار: بۆچی بە ئەبو بەکریان دەوت صدیق (ڕاستگۆ)؟

وەڵام: لەبەر ئەوەی ئەبو بەکر زۆر باوەڕی هەبوو بە پێغەمبەر(ﷺ) و هەرچیەك فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بوایە دەیوت ڕاست دەکات و هیچ گومانێکی نەبوو لە ڕاستی فەرموودەکانی.

پرسیار: کێ هەواڵی هاتنی ئاینی ئیسلامی گەیاند بە ئەبو بەکر؟

وەڵام: ئەو کەسەی ئەو هەواڵەی دا بە ئەبو بەکر، خودی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە چوو بۆ لای ئەبو بەکری هاوڕێی دێرینی و لەبەر ئەوەی متمانەی تەواوی هەبوو بە ئەبو بەکر، بڕیاری دا ئەو هەواڵەی پێ بدات، ئەبو بەکریش یەکسەر باوەڕی پێ هێنا.

## پەند و ئامۆژگاری

١- ئەگەر ماتمانەمان بە هەر هاوڕێیەکی چاکمان هەبوو، با نهێنی و گرفت و باسەکانمان لای ئەو باس بکەین، چونکە هاوڕێی چاکی بە متمانە دەتوانێت یارمەتیت بدات.

٢- ئەگەر موسڵمان دەوڵەمەند بێت، دەتوانێت ماڵ و سامانەکەی لە ڕێگەی خێر و چاکەدا بەکار بهێنێت، بەڵام کەسی هەژار ناتوانێت یارمەتی خەڵکی هەژار بدات بە پارە، بۆیە موسڵمان دەبێت هەوڵ بدات لە ڕێگەی حەڵاڵەوە و بەو جۆرەی خوا پێی خۆشە ماڵ و سامان بە دەست بخات.

٣- کە فەرموودەیەکمان بیست، کە وترا ئەمە فەرموودەی دروستی پێغەمبەر(ﷺ)ە دەبێت بەبێ بیرکردنەوە و دوودڵی یەکسەر باوەڕی پێ بکەین وە بە ڕاست و دروستی بزانین، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆیەوە قسە ناکات بەڵکو ئەو پەیامی خوای گەورەی پێیە.

٤- ئەگەر قسە یان فەرموودەیەکمان وەرگرت، دەبێت هەوڵ بدەین یەکسەر بیگەیەنین بە کەسانی تری جێ متمانە، تا ئەوانیش لێی سوودمەند بن و ئێمەیش خێرمان بۆ بنووسرێت.

پرسیار: دوای موسڵمان بوونی ئەم کەسانە چی ڕوویدا؟

وەڵام: دوای ئەوە هەریەك لەوانەی موسڵمان بووبوون هەوڵیان دەدا کەسێکی تر موسڵمان بکەن و ئاینی خوای پێ بگەیەنن، ئەبو بەکر لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم کەس بوو کە کەسێکی زۆر لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون، بەمە ڕێژەی موسڵمانەکان زیادی کرد و ژمارەیان زۆر بوو، ئیتر نەیاندەتوانی بە ئاسانی بە یەکتر بگەن و پێغەمبەر(ﷺ) ببینن و گوێ بیستی فەرموودەکانی بن.

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) چ چارەسەرێکی دۆزیەوە بۆ ئەو گرفتە؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی ئەو گرفتە چارەسەر بکات و هەموویان بتوانن پێکەوە کۆ ببنەوە و یەکتری ببینن، بڕیاریداماڵێك هەڵبژێرێت تا هەمویان تێیدا کۆ ببنەوە، بۆ ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی) هەڵبژارد تا موسڵمانان بە نهێنی بێ باوەڕان تیایدا کۆببنەوە و بتوانن پێغەمبەر(ﷺ) ببینن تا باسی ئیسلامیان بۆ بکات.[١]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی هەڵبژارد؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئەم هۆکارانە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی هەڵبژارد:

١- لەبەر ئەوەی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی هەڵبژارد خۆی وەك موسڵمان نیشان نەدابوو، بۆیە هیچ کەس گومانی نەدەبرد موسڵمانان لەوێ کۆببنەوە و گفت و گۆ بکەن، خۆ ئەرقەم خۆی موسڵمان بوو، بەڵام لە لای بێ باوەڕان خۆی بە موسڵمان نیشان نەدەدا و کەس نەیدەزانی ئەرقەم چی دەکات و موسڵمان بووە.

٢- ئەرقەم لە هۆزێك بوو کە دژی هۆزی هاشمیەکان بوو، واتا ئەگەریش بێ باوەڕان بیانزانیایە کە ئەرقەم موسڵمان بووە و موسڵمانان دەچنە ماڵەکەی نەیاندەتوانی هێرش بکەنە

---

[١]. محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٦٥).

سەری و ماڵەکەی وێران بکەن و موسڵمانان بکوژن، چونکە ئەگەر ئەوەیان بکردایە جەنگ لە نێوان هەردوو هۆزەکەدا ڕووی دەدا.

٣- ئەرقەم تەمەنی زۆر نەبوو، ئەو ١٦ ساڵان بوو، بۆیە کەس گومانی نەدەچوو بۆ ئەوەی کەسێکی بچووکی وا بتوانێت کارێکی وا گەورە بکات.

٤- ماڵی ئەرقەم لە دەرەوەی شاردا بوو، موسڵمانەکانیش بە شەودا دەچوون بۆ ئەوێ، ئیتر بۆیە شوێنەکەیان نادیار بوو بۆ بێباوەڕان و لەوێ بەبێ خەم کۆدەبوونەوە.[1]

## پەند و ئامۆژگاری

١- لێرەوە فێری ئەوە دەبین کە هاوەڵان چەندە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوون و کەسیان لاساری نیشان نەدەدا و بڵێ با ماڵێکی تر یان لە شوێنێکی تر بێت، بەڵکو یەکسەر هەموویان ڕازی بوون و ئامادە بوون بە شەوو ڕۆژ لەخزمەتی فەرموودەکانیدا بن.

٢- نەبێت کاتێك ئیشێك دەکەین لە خۆمانەوە دەست پێ نەکەین، بەڵکو دەبێت بیری لێ بکەینەوە و بزانین چۆن باشە وا بکەین، هەروەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە کارەکانیدا ورد دەبوویەوە و سەیری دەکرد چۆن زۆر باشە بەو شێوازەی دەکرد.

٣- هۆزایەتی یان نەتەوایەتی گرنگ نیە لە ئاییندا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە موسڵمان بین، براکانی ئێمە ئەوانەن کە موسڵمانن دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) سەر بە هاشمیەکانە، ئەرقەمیش سەر بە مەخزومیەکانە ئەم دوو هۆزە دژی یەکتر بوون، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەرقەم یەکتریان زۆر خۆش دەویست و هیچ گوێیان نەدەدا بە دوژمنایەتی هۆزەکانیان چونکە ئەو هۆزانە لەسەر شتێکی ناڕاست و بێ بنەما جەنگیان دەکرد و هیچ کامێکیان نەچووبوونە ناو ئیسلامەوە.

[1] د. علی محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٩٩).

## پێغەمبەر (ﷺ) چ وانەیەکی فێری هاوەڵان کرد؟

پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك وانەیەکی فێری هاوەڵان دەکرد و لە ماڵی ئەرقەم کۆی دەکردنەوە، چەند وانەیەکی گرنگی فێر دەکردن، گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١- باوەڕبوون بە خوای گەورە و پشت بەستن بە خوا: پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەکردن کە تەنها خوایەك ئەم ئاسمان و زەوی و شتانەی دروست کردووە و دەیانپارێزێت، تەنها(الله)یە، خودا مرۆڤەکان دروست دەکات و گیانیان بە بەردا دەکات و ڕۆزیان دەدات هەروەها ئاینی خۆی دەنێرێت بۆیان تا وەری بگرن و گومڕا نەبن، جا هەر کەسێك باوەڕی هێنا بەو ئاینە ئەاو خوای گەورەی لە پشتە و خوای گەورە دەیپارێزێت یان ئەوەیە خوای گەورە سەری دەخات بەسەر بێ باوەڕاندا و لە دوارۆژیشدا دەیخاتە بەهەشتی بەرینەوە، یان ئەوەیە خوای گەورە شەهیدی پێ دەبەخشێت و بە دەستی بێ باوەڕان دەکوژرێت، ئەو کات خوای گەورە یەکسەر دەیباتەوە بۆ لای خۆی و چی دەوێت بۆی دەکات و لە بەهەشتدا شوێنێکی بۆ دادەنێت، خوای گەورە موسڵمانانی خۆش دەوێت و لە گوناهەکانیان خۆش دەبێت.

٢- خۆشەویستی موسڵمانان بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ): موسڵمانان لە وانەکان ئەوە فێر دەبوون کە خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ)یان لە هەموو کەس زیاتر خۆش بوێت، چونکە تەنها ئەوە سوودیان پێ دەگەیەنێت، هەر کەسێك خوا و پێغەمبەری خۆش بوێت، لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەواندایە، هەر کەسیش ڕقی بێت لە خوا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا دۆزەخ شوێنیەتی، بەڵکو دەبێت موسڵمان خوا و پێغەمبەری لە دایك و باوکی و برا و خوشکی و خۆیشی زیاتر خۆش بوێت، نەوەك دایك و باوکی یان خۆی زیاتر خۆش بوێت چونکە ئەوە تاوانە.

٣- پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەکردن کە هیچ کەس ناتوانێت سوود و زیان بگەیەنێت بە کەس، مەگەر بە فەرمانی پەروەردگار نەبێت، بێباوەڕانیش ناتوانن زیان بگەیەنن بە موسڵمانان مەگەر خوای گەورە بیەوێت موسڵمانان تاقی بکاتەوە تا بزانێت کامیان واز لە ئیسلام دێنێت و کامیان هەر موسڵمانە.

٤- خۆڕاگری: دەبێت موسڵمان لەبەردەم سەختی و ناخۆشیەکانی ژیاندا خۆڕاگر بێت، ماندوو نەبێت و واز نەهێنێت، چونکە ئێمە کاتێك لەم دنیایە دەژین خوای گەورە تاقیمان

دەکاتەوە تا بزانێت کامان خۆڕاگرین و واز ناهێنین، ئەگەر هاتوو پارەمان نەبوو یان نان نەبوو بیخۆین یان دەوڵەمەند نەبووین ئەبێت نەچین دزی و تاوان بکەین یان ئازاری دایك و باوکمان بدەین و نەڵێین هەر دەبێت خەرجی و پارەمان بدەنێ و خۆراکی خۆشمان دەوێت، چونکە ئەگەر دایك و باوکمان نەیانبوو ئەوا دەبێت ئێمەیش لەگەڵ ئەواندا خۆڕاگر بین و بڵێین دایە گیان بابە گیان خوای گەورە تاقیمان دەکاتەوە، دەبێت ئێمە واز نەهێنین، ئەگەر بێباوەڕان ئازارمان بدەن دەبێت هەر واز نەهێنین و بڵێین ئێمە موسڵمانین.

٥- دڵسۆزی: پێغەمبەر(ﷺ) لەوانەکانیدا هاوەڵانی فێری ئەوە دەکرد کە دڵسۆز بن و کەمتەرخەمی نەنوێنن، هەرچی کارێکیان پێ دەکرێت بیکەن، بەڵام نابێت کاتێك کارێکی چاك دەکەن لەبەر ئەوە بیکەن کە خەڵك پێیان بڵێ ئێوە چاکن، چونکە ئەوە سزاکەی دۆزەخە، بەڵکو دەبێت تەنها لەبەر خوا ئیشی چاك بکەین و چاوەڕێ نەبین کەس پێمان بڵێ دەستت خۆش یان تۆ چاکیت، چونکە ئێمە بۆ خوا ئیش دەکەین و پاداشتیش لەو وەردەگرین.

٦- کاری چاکە کردن وانەیەکی تر بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) فێری هاوەڵانی دەکرد، دەبێت موسڵمان هەمیشە کاری چاکە بکات و نەچێت بە لای خراپەدا، چونکە چاکەکردن لای خوا خۆشەویستمان دەکات و پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە کە بەهەشتە، جگە لەوەی لە دنیا خۆمان سوودی لێ دەبینین بەڵام تاوانکردن مایەی زەرەر و زیانی دنیامانە و خوای گەورەش ئەرەنجێت لێمان و ڕقی لێمان دەکەوێت، ئەگەر خراپەیەکمان کرد ئەبێت بە پەلە تەوبە بکەین و بڵێین خوایە گیان ئەمجارە ئەو تاوانە دووبارە ناکەمەوە و چاکە دەکەم، هەر کەسێك چاکە بکات لە لای خوای گەورە بە چاکە بۆی دەنووسرێت لە دەفتەری تایبەتدا ناوی دەنووسرێت کە ئەو کەسە چاکەی کردووە و دەبێت لە ڕۆژی دواییدا بچێتە بەهەشت، چونکە خوای گەورەو پێغەمبەر(ﷺ) خۆشیان دەوێت.

٧- دوعاکردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە و میهرەبان: موسڵمان دەبێت هەر شتێکی ویست داوا لە خوای گەورە بکات تاکو پێی ببەخشێت، ئەگەر حەزی کرد فێری زانست بێت، دەبێت بچێتە لای مامۆستایەك فێری زانست بێت و خۆی کتێب بخوێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت داوا بکات لە خوای گەورە تا یارمەتی بدات زانستەکە فێر بێت، ئەگەر نا

ئەو كات پاداشتمان لای خوا نابێت، چونكە هەموو شتێك هی خوایە، موسڵمان دەتوانێت لـە هەموو كاتێكدا داوا لە خوا بكات و كەس ناتوانێت رێگەی لێ بگرێت، چونكە خوای گـەورە دەنگی دەبیستێت ئەگەر بە دەنگی زۆر نزمیش قسە بكات هەتا زۆریـش داوا بكـەی خـوای گەورە زیاتر تۆی خۆش دەوێت، خوای گەورە زۆر حەز دەكات گوێ بگرێت لـە دوعـا و نـزای منداڵان و ستەم لێكراوان كاتێك منداڵێك دوعا دەكات خـوای گـەورە بـە جـوانی گـوێی لێ دەگرێت و ئەو منداڵەی زۆر زۆر خۆش دەوێت.

٨- خوێندنەوە و خوێندەواری: پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانانی فێر دەكرد كـە بـا هەمیشـە سەرقاڵی خوێندن و زانست بن، چونكە وڵات و جیهـانی ئیسـلامی تـەنها بـە زانست پـێش دەكەوێت، خوای گەورە زۆر ئەو كەسانەی خۆش دەوێـت كـە فێـری زانسـت دەبـن، هەرچـی فریشتەی خوا هەیە دوعا دەكەن بۆ ئەو كەسانەی دەگەڕێن بە دوای زانستدا و دواتر خـەڵكی تریش فێر دەكەن.

٩- ڕاستگۆیی و قسە جوانی: پێغەمبەر(ﷺ) فێری دەكردن كە هەرگیز نابێت موسـڵمان درۆ بكات، بەڵكو دەبێت ڕاستگۆ بێت، چـونكە خـوای گـەورە هـەرگیز حـەز ناكـات درۆزن ببینێت، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕقیەتی لە درۆزن، هـەروەها دەبێـت جنێـو و قسـەی ناشـرین و غەیبەت نەكەین و قسەی جوان بكەین.

١٠- پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانانی فێر دەكـرد كـە هەمیشـە پشـتگیری حـەق و ڕاسـتی بكەن، تەنانەت ئەگەر برا و خوشكیان خراپ بـوون، نابێـت پشـتگیریان بكـەن، بـەڵێ ڕۆڵـە ئازیزەكانی ئیسلام و موسڵمانان، پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی فێری ئـەم ڕەوشـتانە دەكـرد، جا كامتان خوا و پێغەمبەری خۆش دەوێت با ئەم وانانە فێر ببێـت و جێبـەجێیان بكـات تـا خۆشەویست بێت لە لای خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) و لە قیامەتدا بچێتە بەهەشت.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

١- سروش (وەحی) چیە و کێ هێنانی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)؟

٢- پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی دەچوو بۆ ئەشکەوتی (حراء)؟

٣- خەدیجە چی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ) و دوایی بردی بۆ لای کێ؟

٤- بۆچی خەدیجە وەرەقەی کوڕی نەوفەلی هەڵبژارد تا بچێت بۆ لای؟

٥- یەکەم ئایەتی قورئان کە دابەزی چی بوو؟ چ فەرمانێکی تێدایە بۆ موسڵمانان؟

٦- پێغەمبەر (ﷺ) چی کرد کاتێك فریشتەکە لە ئەشکەوت هات بۆ لای؟

٧- بانگەوازی نهێنی واتای چیە؟ چ سوودێکی هەیە؟

٨- یەکەم ئافرەت کێ بوو کە موسڵمان بوو؟ چۆن موسڵمان بوو؟

٩- یەکەم پیاو کێ بوو کە موسڵمان بوو؟ چۆن موسڵمان بوو؟

١٠- یەکەم منداڵ کێ بوو کە موسڵمان بوو؟ چی پێغەمبەر (ﷺ) بوو؟

١١- ئەرقەم کێ بوو؟ بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی هەڵبژارد؟

١٢- دەتوانیت باسی ئەو وانانە بکەیت کە پێغەمبەر (ﷺ) فێری موسڵمانانی کردن؟

١٣- بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی هێنا بۆ لای خۆی؟

١٤- بۆچی بە ئەبو بەکریان دەوت ڕاستگۆ (صدیق)؟

١٥- کاتێك موسڵمانەکان زۆر بوون پێغەمبەر (ﷺ) چی کرد؟

# بەشی سێیەم

## بانگەوازی ئاشکرا

پاش ئەوەی پێغەمبەر و هاوەڵان بە نهێنی سەرقاڵی بەجێگەیاندنی، ئیسلام و بانگەوازی نهێنی بوون لە نێو خەڵکدا و بێباوەڕان نەیاندەبیست موسڵمانان بە ئاشکرا باسی ئیسلام و یەکتاپەرستی بکەن و خەڵك بانگ بکەن بۆ ئایینی ئیسلام، خوای گەورە دوای ئەوە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان لەمەودوا بە ئاشکرا و لەبەر چاوی خەڵك بانگەواز بکەن بۆ ئایینی ئیسلام و واز بهێنن لە بانگەوازی نهێنی،[1] پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە کەوتە ڕێ بۆ ناو خەڵك و چوویە سەر بەرزاییەك کە لە هەموو خەڵکەکە بەرزتر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هاواری کرد بە ناو خەڵکدا و بانگی کردن تا هەموویان کۆببنەوە و گوێی لێ بگرن، خەڵکەکەش کە ئەوەیان بیست کۆبوونەوە و کەوتنە گوێ لێ گرتنی.[2]

پرسیار: بۆچی خەڵکەکە هەموویان کۆبوونەوە تا گوێ بگرن لە پێغەمبەر(ﷺ)؟

وەڵام: چونکە هەموویان متمانەیان هەبوو بە پێغەمبەر(ﷺ) و ڕێزی زۆریان دەگرت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کەسایەتیەکی گەورەی هەبوو لە لای خەڵك بە گشتی، بۆیە ئامادە بوون کۆببنەوە، کاتێك خەڵکەکە هەموویان کۆبوونەوە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە قسەکردن بۆیان و پێی فەرموون: ئێستا ئەگەر من بڵێم خەڵکێکی زۆر لە پشتەوە دێن و بەرەو ئێرە ئایا ئێوە بڕوام پێ دەکەن؟ خەڵکەکە وتیان: ئێمە هیچ درۆیەکمان لە تۆ نەبیستووە و تۆ هەمیشە ڕاستگۆ بوویت بۆیە هەرچیەك بڵێیت باوەڕت پێ دەکەین.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی باوەڕم پێ بکەن من پێغەمبەری خودام و خوای گەورە منی ناردووە تا ئێوە فێری ئیسلام بکەم و فەرمایشتی خواتان پێ بگەیەنم،[3] کەچی

---

[1] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٨٧).

[2] ـ عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٦٨).

[3] ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە(٧٠).

هەموویان کەوتنە ژاوەژاو و دەمە قاڵە و دوودڵی ڕووی تێ کردن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) چاوەڕێی دەکرد تا بزانێت چی دەکەن، لەو کاتەدا مامێکی پێغەمبەر(ﷺ) کە زۆر خراپ و نەزان بوو کەوتە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(ﷺ)، بەمە خەڵکەکەی تریش باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەر(ﷺ) و کەوتنە گاڵتە پێ کردنی.[1]

پرسیار: ئەو مامەی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو مامەی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی (ئەبو لەهەب) بوو[2] کە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی دەوت: دەستت بشکێت خوای گەورەیش ئایەتی دابەزاندە خوارەوە و فەرمووی: **﴿تبت يدا ابي لهب وتب...﴾**.[3] واتا: دەستی ئەبو لەهەب بشکێت و ئەو قوڕ بە سەر وماڵ کاول بێت.

## پەند و ئامۆژگاری

١- پێویستە خوای گەورە هەرچیمان پێ بفەرموێت ئێمە وا بکەین، نەوەك بە خواست و ئارەزووی خۆمان بجوولێینەوە، ئەگەر خوا فەرموویەتی بە نهێنی بانگەواز بکەن دەبێت بە نهێنی بانگەواز بکەین، ئەگەریش فەرمووی بە ئاشکرا دەبێت یەکسەر گوێڕایەڵی بین.

٢- پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە هەوڵی ئەوەی خەڵکەکە کۆبکاتەوە تا هەموویان گوێی لێ بگرن و بزانن ئەو چیان پێ دەڵێت، نەوەك بچێت یەك یەك بیانگرێت و قسەیان بۆ بکات، بۆیە ئێمەیش کاتێك دەمانەوێت قسەی چاك بکەین دەبێت هەوڵ بدەین خەڵکێکی زۆر گوێمان لێ بگرن تا لێی سوودمەند بن.

٣- کاتێك دەمانەوێت شتێك فێری کەسێك یان خەڵکی زۆر بکەین، نابێت تەنها قسەی بۆ بکەین بەڵکو دەبێت بە کردار بۆی بخەینە ڕوو و نموونەی جوان و ڕوونی بۆ بهێنینەوە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) بە کرداری چوویە سەر بەرزاییەکە و نموونەی بۆ هێنانەوە تا بە جوانی لێی تێ بگەن و گوێی لێ بگەن.

---

[1] ـ عبدالعزيز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، (١٢٢).
[2] ـ ابن الاثير: الكامل في التأريخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٦٦٠).
[3] ـ ابن تيمية: مجموعة الفتاوى، بەرگی هەشتەم، لاپەڕە (٦١٢).

٤- موسڵمان بوون و باوەڕداری بە خزمایەتی نیە، واتا ئەگەر کەسێکمان بینی زۆر موسڵمان و چاك بوو، ئیتر نابێت وا بزانین خزم و کەس و کارەکەشی چاك و باوەڕدارن، وەك دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) خۆی چەندە چاك و باوەڕدارە کەچی مامی زۆر خراپ بوو کەوتە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕی نەهێنا بە ئیسلام، هەروەها پێغەمبەر ئیبراهیم خۆی زۆر باش بووە کەچی باوکی بتی دروست دەکرد، هەروەها پێغەمبەر نوح (علیه السلام) زۆر باش بوو کەچی کوڕەکەی بێ باوەڕ و خراپەکار بوو، بۆیە ئەگەر ئێمەیش خزمی خراپمان هەبوو، دەبێت هەر بەردەوام بین لە موسڵمانیدا.

پرسیار: جیاوازی چیە لە نێوان ئەبو تالیب و ئەبو لەهەب؟

وەڵام: ئەبو تالیب و ئەبو لەهەب هەدووکیان مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، هەردووکیشیان بێ باوەڕ بوون، ئەبو لەهەب گاڵتەی دەکرد بە پێغەمبەر(ﷺ) و دژی ئاینی ئیسلام بوو دەیویست ئازاری موسڵمانان بدات، بەڵام ئەبو تالیب پێغەمبەر(ﷺ)ی خۆش دەویست و پشتگیری دەکرد و نەیدەهێشت بێباوەڕەکان ئازاری بدەن یان بیکوژن[1] جا با بزانین هەندێ جار هەیە کەسێك بێباوەڕە، بەڵام زیانی نیە بۆ باوەڕداران و موسڵمانان.

## ئازاردانی موسڵمانان

بێ باوەڕان کاتێك زانیان بە موسڵمان بوونی ئەو خەڵکە کەوتنە دژایەتی کردن و ئازاردانیان، بۆ ئەمەش هەموو ڕێگەیەکیان دەگرتەبەر، ئەوان کاتێك موسڵمانێکیان دەدی، هەرچیان پێ بکرایە لە ڕووی دەیانکرد و جۆرەها سووکایەتیان پێ دەکرد تا وای لێ بکەن واز لە ئیسلام بهێنێت.[2]

پرسیار: بۆچی بێباوەڕان موسڵمان نەدەبوون و ئازاری موسڵمانانیان دەدا؟

وەڵام: بێباوەڕان لەبەر ئەم هۆکارانە موسڵمان نەدەبوون:

---

[1] ـ ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٥٢).
[2] ـ د. حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٧٠-٧٤).

١- ئەوان دەیانویست چیان دەوێ بیکەن، هەر لە تاوان و خراپە و داوێن پیسی و ستەم و هەر کارێکی تر، بەڵام ئیسلام رێگەی نەدەدا ئەو کارانە بکەن بەڵکو دەبێت ئەوان تەنها ئەو ئیشانە بکەن کە ئاینی ئیسلام فێریان دەکات.

٢- ئەوان هەستی نەتەوەپەرستیان هەبوو و رەگەز پەرستانە بیریان دەکردەوە، ئەوان دەیانوت دەبێت هۆزی ئێمە ئیسلام بگرێتەخۆ، یان ئیسلام بەس بۆ عەرەب بێت، یان دەبێت ئیسلام گوێڕایەڵی خواستەکانی عەرەب بێت و رێگەیان لێ نەگرێت تا ئێمە حەز بە چی دەکەین بیکەین، بەڵام ئیسلام بەمە رازی نەبوو، بەڵکو دەیوت ئاینی خوا بۆ هەموو مرۆڤایەتیە و نەتەوەکان هەموویان وەك یەك وان و تاوان و خراپەیش حەرامە بۆ هەموو کەسێك.

٣- ئەوان دەیان وت دەبێت ئێمە تێکەڵ نەبین لەگەڵ خەڵکی هەژاردا، بەڵکو دەبێت و ئاین و بەرنامەی دەوڵەمەندەکان جیاواز بێت لە بەرنامەی کەسە هەژارەکان.

٤- ئەوان نەزانانە بیریان دەکردەوە و ئامادە نەبوون عەقڵ و هۆشی خۆیان بەکار بێنن تا بزانن ئاینی ئیسلام سوودی هەیە بۆیان یان زیانی هەیە، هەروەها بێباوەڕان هەمیشە لە ئازاردانی موسڵماناندا بوون تا بتوانن موسڵمانان بگێڕنەوە بۆ نەزانی و بێ باوەڕی، واتا ئامانجی ئەوان تەنها ئەوە بوو موسڵمانان بکەنەوە بە بێ باوەڕ و ئاینی ئیسلام لەناوبەرن.

پرسیار: ئایا بێ باوەڕەکان دەتوانن ئاینی ئیسلام لەناو بەرن؟

وەڵام: نەخێر، هەرگیز بێباوەڕان ناتوانن ئاینی ئیسلام لە ناو بەرن، چونەك خاوی گەورە رێگەیان پێ نادات، ئەوەتا زیاتر لە ١٤٠٠ساڵە نەیانتوانیوە لە ناوی بەرن.

## پەند و ئامۆژگاری

١- دەبێت ئێمەی موسڵمان چاوەڕێی ئەوە بکەین هەر کاتێك کەم و لاوازین، بێ باوەڕان ئازارمان بدەن، بەڵام نابێت ئێمە ماندوو بین و نابێت واز بهێنین، بەڵکو دەبێت هەموو هەوڵێکی خۆمان بدەین تا سەر بکەوین بە سەریاندا و بەرنامەی خوای گەورە جێبەجێ بکەین.

٢- هەموو ئامانجی بێ باوەڕان لە ناوبردنی ئیسلام و موسڵمانانە، بۆیە دەبێت پێیان هەڵنەخەڵەتێین و رێگە نەدەین ئەو کارە ناپەسەندە بکەن، خوای گەورەش یارمەتیمان دەدات.

پرسیار: بێ باوەڕان دژایەتی چییان دەکرد؟

وەڵام: بێ باوەڕان دژایەتی ئەمانەیان دەکرد:

١- خوای گەورە.

٢- پێغەمبەر(ﷺ).

٣- قورئانی پیرۆز.

٤- موسڵمانان.[1]

## ١- خوای گەورە:

بێباوەڕان لە دژایەتی خوای گەورە هەستان بە قسە وتن بە خوای گەورە و گاڵتەیان دەهات لە خوای گەورە، ئەوان دەیان وت کە خوای گەورە هەیە، بەڵام دەیان وت خوای ئێمە و خوای موسڵمانەکان جیاوازە، ئەوان بتیان دەپەرست و دەیان وت بتەکان نزیکمان دەکەنەوە لە خوای گەورەن بێباوەڕەکان دەیان وت بە موسڵمانەکان ئێوە ڕۆژێك خوای ئێمە بپەرستن با ئێمەش ڕۆژێك خوای ئێوە دەپەرستین.

پرسیار: بۆچی بێباوەڕان وایان دەوت بە موسڵمانان؟

وەڵام: بۆ ئەوەی:

١- موسڵمانەکان دژایەتیان نەمێنێت لەگەڵ بێباوەڕاندا.

٢- تا بتوانن موسڵمانەکان وا لێ بکەن خوای گەورە و بتەکانی ئەوان وەك یەك سەیر بکەنن ئەگەریش موسڵمانەکان ڕازی بن بەوە ئەو کات هەڵدەگەڕێنەوە و دەبنەوە بە بێ باوەڕ.

پرسیار: ئەی خوای گەورە چی فەرموو بە موسڵمانان؟

وەڵام: خوای گەورە بە موسڵمانانی فەرموو کە بەوە ڕازی نەبن و پێیان بڵێن ئاینی خۆتان بۆ خۆتان و ئاینی خۆمان بۆ خۆمان و ئێمەش وەك ئێوە ناکەین.

پرسیار: خوای گەورە لە کام سورەتی قورئاندا ئەمە دەفەرمووێت؟

[1]- د. علی محمد محمد الصلابی، السيرة النبوية، لاثترة (١٢٢-١٢٨).

وەڵام: خوای گەورە لە سورەتی(الکافرون)دا دەفەرموویێت: ﴿قل یا ایها الکافرون...﴾.[١]

تێبینی: داوا بکە لە مامۆستاکەت واتای ئەم سورەتەت بۆ بکات یان لە کتێبێکدا کە واتای کردووەن واتاکەی بە جوانی بخوێنەوە.

## دژایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ):

بێباوەڕەکان دوای خوای گەورە کەوتنە دژایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و گاڵتەیان پێ دەکرد و قسەی ناڕەوایان پێ دەوت، ئەوان پێیان دەوت: درۆزن، شێت، جادووگەر، شاعیر، کاهین...، بەڵام لە هەموو جارێکدا خۆیان دەکەوتنەوە بە درۆ و نەیاندەتوانی بیسەلمێنن، هەروەها ئەوان بە شێوەی جەستەیش ئازاری پێغەمبەر(ﷺ)یان دەدا، بۆ ئەمە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد و چوویە سوجدە، بێباوەڕەکان پیسی وشتریان هێنا و کردیان بەسەر سەری پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)دا و گاڵتەیان پێ دەکرد، تا فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) هات و توڕە بوو و لایبرد و کەوتە گریان، هەروەها لە ڕێگەکەیدا بەرد و دار و دڕك و چاڵیان هەڵدەکەند تا ئازاری پێغەمبەر(ﷺ) بدەن و ناچاری بکەن واز بهێنێت و بە گوێی ئەوان بکات.[٢]

پرسیار: حەز دەکەیت تۆ لە خۆشیدا بیت و پێغەمبەر(ﷺ) ئازار بدرێت؟

## دژایەتی کردنی قورئان:

هەروەها بێباوەڕان دژایەتی قورئانیان دەکرد و دەیان وت هەمووی درۆیە و قسەی گێلانەیە و هیچی ڕاست نیە، کەچی کاتێك دەیانبیست بێدەنگ دەبوون و هیچیان بۆ نەدەکرا و دەوەستان، ئەوان هەوڵیان دا شتێك بنووسن لە قورئان باشتر بێت یان وەك ئەو بێت کەچی نەیانتوانی.

---

[١] ـ قورئانی پیرۆز، سورەتی الکافرون، لاپەڕە (٦١٢).

[٢] ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٦٠ تا دواتر).

## دژایەتی کردنی موسڵمانان:

پاش ئەمانە بێباوەڕان دەهاتن دژایەتی موسڵمانانیشیان دەکرد و ئازاریان دەدان و گاڵتەیان پێ دەکردن، پشت بە خوا دواتر چەند نموونەیەك باس دەکەین و پەند و ئامۆژگاریان پێ وەردەگرین.

پرسیار: ئەی بۆچی خوای گەورە فەرمانی کرد کە جەنگ نەکەن؟

وەڵام: چونکە:

١- موسڵمانان ژمارەیان کەم بوو هەروەها تازە دامەزراو بوون و نەدەکرا بەبێ ئەوەی ژمارەیان زۆر بێت و بڵاو ببنەوە جەنگ بکەن، چونکە هێشتا ئەوان چەکیشیان پێ نەبوو، ئیتر چۆن جەنگ بکەن؟

٢- بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە موسڵمانان خۆڕاگرن و ئەوان ئاژاوەگێڕ نین، بەڵام هەر دەبێت دواتر تۆڵەی خۆیان بسەننەوە.[١]

پرسیار: بۆچی خوای گەورە موسڵمانانی ڕزگار نەکرد لەو ئازار و ئەشکەنجەیە؟

وەڵام: خوای گەورە دەیتوانی موسڵمانان ڕزگار بکات، بەڵام لەبەر ئەم هۆکارانە ڕزگاری نەکردن:

١- خوای گەورە ویستی موسڵمانەکان تاقی بکاتەوە تا بزانێت کامیان خۆڕاگرە و کامیان لاوازە و خۆی ناگرێت، ئەوەی خۆڕاگرە و لەسەر ئاینی ئیسلام و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوامە، ئەو کەسە پاداشتەکەی بەهەشتە و لای خوایە، هەر کەسیش خۆی نەگرێت و هەڵگەڕێتەوە بێتە بێباوەڕ، وەك بێباوەڕان دەچێتە دۆزەخ، واتا خوای گەورە ویستی پاك و پیس و خۆڕاگر و لاواز جیا بکاتەوە.

٢- تا موسڵمانان دەروونی خۆیان ڕا بهێنن لەسەر هەموو بارودۆخێکی سەخت و ناخۆش، نەوەك ئەگەر لەسەر خۆشی و کامەرانی بژیت و دواتر تووشی سەختیەك بن خۆیان ڕانەگرن و واز بهێنن یان لە ناو بچن.

---

[١]- محمد قطب، چۆن بانگەوازی خەڵك بکەین.

٣- تا مرۆڤەکان بە گشتی خراپە و دڕندەیی و ستەمەی بێباوەڕانیان بۆ دەربکەوێت، چونکە ئەو بێباوەڕانە هەمیشە ئازاری موسڵمانیان دەدا، کەچی کاتێک موسڵمانەکان سەرکەوتن ئازاری بێباوەڕەکانیان نەدەدا و تۆڵەی خۆیان لێ نەسەندنەوە.

٤- خوای گەورە موسڵمانانی ڕزگارنەکرد لەو ماوەیەدا، تا پلە و پایەیان بەرز ببێتەوە و خوای گەورە پاداشتی زۆریان بۆ دابنێت، چونکە هەر موسڵمانێك لە دنیا تووشی ئازار و نارەحەتی ببێت خوای گەورە لە جیاتی ئەوەدا چاکەی بۆ دەنووسێت و پاداشتی خێری دەداتەوە کە بەهەشتی بەرین و هەمیشەییە.[1]

پرسیار: ئایا بێباوەڕان سوودیان بینی لە ئازاردانی موسڵماناندا؟

وەڵام: نەخێر، موسڵمانان هەرگیز وازیان نەدەهێنا و ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبوون بۆیە بێباوەڕان لە جیاتی ئەوەی موسڵمانان کەم بکەنەوە کەچی زیادیان دەکرد، هەروەها جیهان بە گشتی کاتێك ئەو کارە توند و تیژانەی عەرەبە بێباوەڕەکانیان بینی لێیان بێزار بوون و پایەی عەرەبە بێباوەڕەکان لە لایان دایەزی، چونکە هەر کەسێك دژایەتی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) و ئیسلام بکات هەر دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان سەری شۆڕ بکات و لە ناو بچێت، ئەگەریش بێباوەڕ ماوەیەك دەسەڵاتی هەبێت، با دڵی خۆی خۆش نەکات چونکە خوای گەورە دەیەوێت تاوانیان زیاتر ببێت و بەشیان نەمێنێت و بیانخاتە دۆزەخەوە.

[1] ـ محمد قطب، چەمکانێ کە دەبێت ڕاست بکرێنەوە.

# چەند نموونەیەکی ئازاردانی موسڵمانان

با لێرەدا چەند نموونەیەك بخەینە ڕوو لەو نموونانەی کە بێباوەڕان ئازاری موسڵمانانیان دەدا:

## ١- ئەبو بەکری صدیق:

ئەبو بەکر هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی زۆر خۆش دەویست و هەمیشە حەزی دەکرد لەگەڵیدا بێت. جارێکیان بێباوەڕان گوێیان لە ئەبو بەکر بوو کە باسی ئیسلامی دەکرد و پێغەمبەریش(ﷺ) لە لای ئەبو بەکردا بوو، بێباوەڕەکان بە پەلە کۆبوونەوە و بڕیاریاندا ئازار و ئەشکەنجەی ئەبو بەکر بدەن تا جارێکی تر باسی ئیسلامەتی نەکات، بۆیە بە دار و نەعل و شەق و زللە کەوتنە ئازاردانی ئەو هاوەڵە ئازیزە و دەم و چاویان پڕکرد لە خوێن و ئازارێکی زۆریان دا تا لە هۆشی خۆی چوو، لەو کاتەدا هەندێ کەس کە لە هۆزی (بەنو قەیم) بوون ئەبو بەکریان خستە بەتانیەکەوە و بردیانەوە بۆ ماڵی خۆی و بێزار بوون لەو هەڵوێستە ناشرینە و وتیان ئەگەر ئەبو بەکر بمرێت، دڵنیا بن تۆڵەتان لێ دەسەنینەوە، ئەبو بەکر بە هۆشدا هاتەوە و خەڵکەکە هەواڵیان دەپرسی ئەبو بەکر یەکسەر وتی کوا پێغەمبەر(ﷺ)؟ چی بەسەر هاتووە؟ حاڵی چۆنە؟ ئەو هاوەڵە ئازیزە بیری لای ئازارەکانی خۆی نەبوو، بەڵکو بیری لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو هەواڵی ئەوی دەپرسی، پاشان خەڵکەکە چوون و تەنها دایکی مایەوە لە لای، ئەو کات ئەبو بەکر زۆر تکای کرد لە دایکی تا هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ وەربگرێت، دایکیشی چوو بۆ لای ژنێکی موسڵمان کە ئەبو بەکریش و پێغەمبەر(ﷺ)یشی دەناسی پرسیاری کرد تا بزانێت بارودۆخی پێغەمبەر(ﷺ) چۆنە؟ چونکە ئەبو بەکر تەواو لە بیری ئەودایە، بەڵام ژنەکە کە ناوی دایکی جەمیل بوو، وتی من نە ئەبو بەکر دەناسم و نە پێغەمبەر دەناسم، بەڵام ئەگەر حەز دەکەیت دێم بۆ لای کوڕەکەت بزانم چیەتی؟ کاتێك چوو بۆ لای ئەبو بوکر زۆر بێتاقەت بوو و خەریك بوو بگری و وتی یاخوا دەستیان بشکێت بۆچی وایان لێ کردیت؟ ئەویش وتی: دایکی جەمیل ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بارودۆخی چۆنە؟ دایکی جەمیلیش بە سووکی بە ئەبو بەکری وت: ئاخۆ

دایکت لێرەیە ناکرێت بزانێت، ئەبو بەکر پێی وت: خەم مەخۆ، دایکم خراپ نیە و گوێی پێ مەدە، ئەو ژنێکی باشە و شت ناگێڕێتەوە، دایکی جەمیلیش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) زۆر باش و لەش ساغە و لە ماڵی ئەرقەمە، ئەبو بەکریش وتی: سوێند بە خوا تا پێغەمبەر(ﷺ) نەبینم نە نان دەخۆم و نە ئاو دەخۆمەوە، بۆیە چاوەڕوانیان کرد تا بارودۆخەکە هێور بوویەوە ئەو کات دایکی جەمیل و دایکی ئەبو بەکر هەر یەکەیان لایەکی ئەبو بەکریان گرت و بردیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

یەکسەر پێغەمبەر(ﷺ) باوەشی پیا کرد و ماچی کرد موسڵمانەکانیش باوەشیان پیاکرد، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری ئەبو بەکری کرد و فەرمووی: ئەبو بەکر، ئەبو بەکریش وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکەوە بە قوربانت بم، من ئازارێکی وام نیە ئەمە دایکمە و زۆر لەگەڵم چاکە، دوعای بۆ بکە با موسڵمان بێت و پێی بڵێ با موسڵمان بێت، پێغەمبەریش(ﷺ) دوعای بۆ کرد و پێی فەرموو با موسڵمان بێت، بەمە دایکی ئەبو بەکریش موسڵمان بوو و ژمارەی موسڵمانەکان زیادی کرد.[١]

پرسیار: بۆچی ئەبو بەکر داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا دوعای چاکە بکات بۆ دایکی؟

وەڵام: چونکە دایکی ئەبو بەکر زۆر چاك بوو لەگەڵ ئەبو بەکردا و خزمەتی دەکرد ئەبو بەکریش ئەوی خۆش دەویست، بۆیە حەزی نەکرد بچێتە دۆزەخەوە.

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت ئێمە لە هەموو کاتێکدا هەوڵ بدەین باسی ئیسلام بکەین و نەترسین لە بێباوەڕان.

٢- دەبێت ئێمە پێغەمبەر(ﷺ)مان لە خۆمان خۆشتر بوێت و حەز بکەین هەمیشە پێغەمبەر(ﷺ) ببینین، ئەویش بەوەی دوعا بکەین خوای گەورە لە دنیادا بە خەوی خۆش

[١]- د. علی محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (١٤٧).

نیشانمان بدات و ئێمەیش بە گوێی فەرموودەکانی بکەین، لە ڕۆژی دواییشدا بچینە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) و لە لایدا دابنیشین و قسەی لەگەڵدا بکەین.

٣- دەبێت ئەو شتانەی زۆر گرنگن لای هەموو کەس باسیان نەکەین و ئەو شتانەی نهێنین، وەك دەبینین دایکی جەمیل بە دایکی ئەبو بەکری نەوت کە پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێیە و چی دەکات، بەڵکو خۆی بێ ئاگا کرد تا شوێنەکە دەرنەکەوێت.

٤- دەبێت ئیشەکانمان لە کاتی خۆیاندا بکەین، نەوەك هەر لە خۆوە چیمان ویست یەکسەر دەست پێ بکەین، سەیرکەن ئەبو بەکر نەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا خەڵکەکە چوون و بارودۆخەکە ئاسایی بوویەوە و کەمێك لەش ساغ بوویەوە و ئەو کات چوو.

## ٢- بێباوەڕان دەیانەوێت پێغەمبەر (ﷺ) پەشیمان بکەنەوە:

هەموو جارێك بێباوەڕان کۆدەبوونەوە و پێکەوە قسەیان دەکرد تا بزانن چی بکەن کە بتوانن پێغەمبەر (ﷺ) پاشگەز بکەنەوە و وازی پێ بهێنن، ئەمجارەیان پلانێکی تازەیان دانا و چوون بۆ لای ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر (ﷺ) و داوایان کرد تا ئەبو تالیب تکا بکات لە پێغەمبەرﷺ تا واز بهێنێت ئەوان وتیان چەندە پارە و ماڵ و سامانی دەوێت دەیدەینێ، چەندە ژن و کچی دەوێت پێی دەدەین، دەیکەین بە گەورەی خۆمان بەڵام با واز بهێنێت لەم کارەی.[1]

پرسیار: بۆچی بێباوەڕان چوون بۆ لای ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر (ﷺ)؟

بێباوەڕان نەچوون بۆ لای مام و خزمەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) ئەوان چوون بۆ لای ئەبو تالیب، چونکە دەیانزانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو تالیبی خۆش دەوێت و گوێی بۆ دەگرێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە منداڵیەوە هەر لە لای ئەبو تالیب بووە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە بۆ ماڵەوە، ئەبو تالیب پێی وت پێغەمبەر گیان برازای شیرینم،

[1] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، (١٣٥).

گەورەکانی قورەیش و مەککە هاتوون بۆ لام و داوام لێ دەکەن بە تۆ بڵێم واز بهێنیت لەم کارەت و چی شتێکت دەوێت ئەوان پێت دەدەن.

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: مامە گیان سوێند بە خوا ئەگەر خۆر و مانگ بخەنە دەستی ڕاست و چەپم، من واز ناهێنم لەم کارە و بانگەواز دەکەم بۆ ئیسلام، یان دەبێت لەم ڕێگەیەدا شەهید ببم یان دەبێت سەربکەوم و دینی خوا سەربخەم، ئەبو تالیبیش وتی: دەی باشە کوڕم بەردەوام بە منیش پشتگیریت دەکەم.[1]

## پەند و ئامۆژگاری

١- بێباوەڕان هەرگیز واز لە موسڵمانان ناهێنن و هەر جارە و پلان و تەڵەکەیەك دەنێنەوە بۆ موسڵمان تا لە خشتەی بەرن و بیبەن بەرەو گومڕایی بە تایبەت ئەوان زۆر گرنگی دەدەن بە پارە و بە ژن و بە کچ، چونکە مرۆڤ زوو بە پارە هەڵدەخەڵەتێت، کوڕ و کچیش زوو بە یەکتر هەڵدەخەڵەتێن و تووشی تاوان دەبن.

٢- نابێت لەبەردەم خزم و کەس و کارماندا ڕووگیر بین و واز بهێنین، بۆ نموونە ئەگەر مام یان خاڵێکمان وتی نوێژ مەکە و بۆ خۆت دانیشە، نابێت بە گوێی بکەین، بەڵام دەبێت بە ڕێزەوە وەڵامی بدەینەوە و تووڕە نەبین.

## ٣- ئازاردانی عەممار و شەهیدکردنی دایك و باوکی:

عەممار کوڕی یاسر بوو، دایکیشی ناوی سومەییە بوو، ئەوان لە بنەڕەتدا خەڵکی یەمەن بوون و هاتبوونە مەککە، واتا لە مەککەدا خزم و کەس و کاریان نەبوو، کاتێك عەممار زانی ئاینی ئیسلام هاتووە موسڵمان بوو دوای ماوەیەکی کەمیش دایك و باوکیشی موسڵمان بوون، بەمە خێزانێکی موسڵمانیان پێك هێنا، کاتێك بێباوەڕەکان بەمەیان زانی تەواو تووڕە بوون و هەرسێکیان گرتن و کەوتنە ئازار و ئەشکەنجە دانیان، لەوانە لە هاوینی گەرم دەیانخستنە سەر زەوی تا خۆر لێیان بدات و ئازاریان پێ بگات، دوایی بە قامچی و بە دار

[1] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٩٦).

لێیان دەدان و ڕایاندەکێشان بەسەر زەویدا و نان و ئاویان پێ نەدەدان، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ئەمەی بینی زۆر بێتاقەت بوو، ئینجا پێی فەرموون: ئەی ماڵ و خێزانی یاسر (واتا هەرسێکیان) خۆتان ڕابگرن چونکە بەهەشت چاوەڕێتانە، بۆیە ئەوان دڵیان خۆش بوو و زیاتر خۆیان ڕادەگرت و وازیان نەدەهێنا لە ئیسلام، ئەبو جەهل کەسێکی پیس و بێباوەڕ بوو هات بۆ لای سومەیە و وتی تۆ حەزت لە جوانی پێغەمبەر کردووە، بۆیە موسڵمان بوویت، ئەویش تووڕە بوو و تفێکی کردە ناو چاوی ئەبو جەهل، ئەبو جەهلیش سومەیەی کوشت، بەمە یەکەم شەهیدی ئیسلام ژنێك بوو بە ناوی سومەییە، یاسری باوکی عەمماریش هێندە سزا درا تا لە ژێر ئازاری سزادا کۆچی دوایی کرد.

سەرەی عەممار هات ئەوان وتیان ئەگەر قسە نەڵێیت بە پێغەمبەر ئەوا وەك دایك و باوکت تۆ دەکوژین، ئەویش بە ناچاری قسەی وت بە پێغەمبەر(ﷺ) دوایی کە ئازاد بوو بە گریانەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی ناچاریان کردم قسەت پێ بڵێم، بەڵام بە خوا لە دڵەوە حەزم نەکرد قسەت پێ بڵێم، پێغەمبەریش (ﷺ) بە پێی فەرمانی خوای گەورە پێی فەرموو ئەگەر کەسێك زۆری لێکرا تا کوفر بکات یان قسە بڵێت ئەگەر لە دڵەوە حەز نەکات ئەوا قەیناکات با نەیکوژن و کوفرەکە بکات یان قسە بڵێت بە هەر کەسێك ئەوان دەیڵێن، بەڵام نابێت لە دڵەوە حەز بکات بەڵکو بڵێ خوایە گیان من ناچارم ئەگەر نا هەر موسڵمانم و حەز ناکەم کوفر بکەم.[١]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- موسڵمانێتی بە کوڕ و کچ و ژن و پیاو نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کێ زیاتر موسڵمانە، چونکە سومەییە ژن بوو، کەچی یەکەم شەهیدی ئیسلام بوو.

٢- ئەگەر زۆرمان لێکرا تا کوفر بکەین و زانیمان ئەگەر کوفر نەکەین ئەوا دەمانکوژن، ئەو کات خوای گەورە ڕێگەمان پێ دەدات بەڵام دەبێت لە دڵەوە حەز نەکەین.

[١]ـ خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، لاپەڕە(٢٣٥-٢٤١) .

٣- نەبێت ئامادەبین دایك و باوك و خوشك و براشمان لە ڕێگەی خوای گـەورەدا شـەهید بن، نەوەك ئەگەر هەڕەشەیەكمان لێكرا واز هبێنین لە دینداری.

پرسیار: ئایا عەممار گوناهبار بوو كاتێك قسەی وت بە پێغەمبەر(ﷺ)؟

وەڵام: نەخێر، گوناهبار نەبوو چونكە لە دڵەوە حەزی نەدەكرد و پێغەمبـەر(ﷺ)ی خـۆش دەویست.

## ٤ـ بیلالی حەبەشی:

بیلال هاوەڵێكی خۆشەویست و بەڕیزی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەو كۆیلە بوو، واتا بێباوەڕان بە پارە دەیان كڕی و ئیشیان پێ دەكرد تا مردن و نەیدەتوانی هیچ شتێك بكات، مەگـەر بـە ئارەزوو و فەرمانی ئەوان نەبێت، چونكە كۆیلەی ئەوان بوو، بیلال بە نهێنـی و بـەبێ ئـەوەی بێباوەڕەكان ئاگادار بن موسڵمان بـوو، جـا كاتێـك بـێ باوەڕەكـان بەمـەیان زانـی كەوتنـە ئازاردانی بیلال و بە پەت ڕایان دەكێشا بەسەر زەویدا و بە گەرمای نێوەڕۆی هاویندا لەسـەر زەوی ڕایان دەكێشا و بەردی گەرم و گەورەیان دەخستە سەر سـكی و دەیـان وت دەبێـت بـێ باوەڕبیت ئینجا وازت لێ دەهێنین، بەڵام بیلال وازی نەدەهێنا و دەیوت: (خوا تەنهابـە، خـوا یەكە) (أحد، أحد).[١]

ڕۆژێكیان ئەبو بەكر چوو بە لای بیلالدا، كاتێك بینی بیلال چەند ئازاری دەدرێت، بـیلالی كڕی و دواتر بیلالی ئازاد كرد، بەمە بیلال ڕزگاری بوو لەو ئازارە.[٢]

## * پەند و ئامۆژكاری:

١- لە ئیسلامدا هەژاری و دەوڵەمەندی و ڕەش و سپی جیاوازیان نیـە، مەگـەر تـەنها جیاوازیان لەوەدا هەبێت كە كامیان زیاتر چاكە دەكات و لە خوای گەورە دەترسێت.

---

[١] ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٨٣).

[٢] ـ د. حامد احمد الطاهر: حیاة الصحابة للاطفال، لاپەڕە (٢٦٥) .

٢- ئەگەر پارە و سامانمان هەبوو، دەبێت یارمەتی برا وخوشکە موسڵمانەکانمان بدەین و قەرزەکانیان بدەینەوە و لە سەختی ڕزگاریان بکەین.

## ٥ـ خەبباب کوڕی ئەرەت:

خەبباب منداڵێکی بچووك بوو لەگەڵ دایك و باوکیدا دەژیا، کاتێك جەنگ ڕوویدا دایك و باوکی کوژران و خەببابیش برا بۆ مەککە تا لەوێ بیفرۆشن بە خەڵکی ئەوێ، لەوێ ژنێك خەببابی کڕی تا ئیشی بۆ بکات و پارەکەی بدات بەو، ئەو ژنە خەببابی برد بۆ لای ئاسنگەرێك تا ئیشی بۆ بکات، خەبباب لەوێ فێری ئیشی ئاسن و دروستکردنی شمشێر بوو و ئیشی دەکرد و پارەکەی دەبردەوە بۆ ژنەکە، جارێکیان ئەبو بەکر هات بۆ لای خەبباب و باسی ئاینی ئیسلامی بۆ کرد، تا ئەوەی خەبباب دڵی چوویە سەر ئاینی ئیسلام و موسڵمان بوو.[1]

کاتێك خەڵکی بەو شتەیان زانی و خەبەریان بردەوە بۆ ژنەکە کە خەبباب موسڵمان بووە ژنەکە کەوتە ئازاردانی خەبباب، ئەو ئاسنی گەرم دەکرد و دەیدا لە دەست و قاچ و سەر و پشتی خەبباب، هەروەها سکڵی گەرم دەکرد و بە پشت خەببابی دەخستە سەر تا هەموو لەشی خەبباب دەکەوتە قرچەقرچ و دەسوتا و خەبباب هاواری دەکرد، بەڵام خەبباب وازی نەهێنا و هەموو جارێك نزای خێری دەکرد و لە خوا دەپاڕایەوە، خوای گەورەش تۆڵەی خەببابی کردەوە و ژنەکەی تووشی نەخۆشی کرد، کاتێك ژنەکە چوو بۆ لای دکتۆر تا چارەسەری بکات، دکتۆر پێی وت: دەبێت هەموو ڕۆژێك ئاسن گەرم بکەیت و بیدەیت لە سەری خۆت، ئیتر هەموو ڕۆژێك ژنەکە دەیوت بە خەبباب وەرە ئاسنەکە گەرم بکە و بیدە لە سەرم، ئەو کات ژنەکە قیژ و قاوی دەکرد و دەگریا و خەببابیش سەیری دەکرد و پێدەکەنی.[2]

---

[1] ـ عبدالرحمن رعفت الباشا: صور من حياة الصحابة، لاپەڕە.
[2] عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، (١٤٨).

## پەند و ئامۆژگاری

١- هەر کەسێك ستەم بکات ئەوا خوای گەورە سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە، ئیتر زوو بێت یان درنگ وەك چۆن تۆڵەی خەبابی سەندەوە لە ژنەکە.

٢- خوای گەورە دوعاکانمان دەبیستێت و گیرایان دەکات، بەڵام نابێت ئێمە پەلە بکەین، بەڵێ منداڵە نازیز و خۆشەویستەکان، سەیرکەن موسڵمانەکانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) چەندە ئازار و نارەحەتیان چەشتووە، تا ئاینی ئیسلامیان پاراست و سەریان خست و گەیاندیان بە ئێمە، دەی با ئێمەیش رێزیان لێ بگرین و دوعای چاکەیان بۆ بکەین و سوود وەرگرین لەو ژیانە پاك و چاکەیان.

## * پیلانەکانی بێباوەڕان هەڵدەوەشێنەوە:

بێباوەڕان لە نێو خەڵکیدا ئەوەیان بڵاودەکردەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) شێت بووە و کەسێکی ناتەواوە، ئیتر هەر کەسێك بهاتایە بۆ مەککە، یەکسەر دەچوو بۆ لای و پێیان دەوت کە کەسێك هەیە ناوی پێغەمبەرە و شێت بووە و لە خۆیەوە قسە دەکات، بۆیە بڕوای پێ نەکەنن یەکێك لەو کەسانەی هات، ناوی (ضماد) زیادی ئەزدی بوو، ئەو پزیشکی چارەسەرکردنی نەخۆشی شێتی بوو، واتا هەر کەس شێت بووایە دەیانبرد بۆ لای ئەو تا یان چارەسەری بکات یان قسەیەکی لەسەر بکات، جا کاتێك زیاد بیستی، کە پێغەمبەر ناوێك لە مەککەدا شێت بووە، وتی من دەچم بۆ لای بزانم شێتە یان نا، ئەگەر شێت بووە با چارەسەرێکی بکەم، ئەگەر نا ئەگەر شێت نەبووە بزانم چی دەڵێت کە ئەم خەڵکە پێی دەڵێن شێت، کاتێك چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پێی وت ئەی پێغەمبەر وەرە چەندین کەس لەسەر دەستی من شفایان بۆ هاتووە، چونکە خوای گەورە بە هۆی منەوە شفای زۆر کەسی داوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە وتاردان و کورتە وتارێکی بۆ دا. زیاد بەمە سەرسام بوو داوای کرد پێغەمبەر(ﷺ) وتارەکەی بۆ دووبارە بکاتەوە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دووبارەی کردەوە، زیاد تەواو سەرسام بوو و وتی: من کاهین و شاعیر و جادوکەرەکانم بیستووە، بەڵام قسەی لەم جۆرەم نەبیستووە.

دواتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دەستت بێنە و موسڵمان ببە، ئەویش دەستی هێنا و موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی هەوڵ دەدەیت خەڵکی ناوچەکەیشت موسڵمان بکەیت؟ وتی بەڵێ بەڵێن دەدەم هەوڵ بدەم، بەمە لە جیاتی ئەوەی بێباوەڕان بتوانن پێغەمبەر(ﷺ) پاشگەز بکەنەوە، کەچی زیماد و خەڵکی ناوچەکەیشی زیادیان کرد بۆ لای موسڵمانان و بێباوەڕان سەرشۆڕ بوون.[1]

پرسیار: بۆچی بێباوەڕان داوایان لە زیماد کرد بچێت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)؟

وەڵام: چونکە زیماد خۆی پزیشك بوو بۆ چارەسەری شێتی، ئەوانیش ویستیان وا نیشان بدەن، کە پێغەمبەر(ﷺ) شێتە، بۆ ئەوەی لای خەڵکی بڵێن پێغەمبەر شێتە و پزیشکی شێتی چووە بۆ لای تا چارەسەری بکات.

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- لێرەوە درۆزنی و بێ شەرمی بێ باوەڕانمان بۆ دەردەکەوێت کە چەندە درۆزن بوون، ئەوان پێشتر بە پێغەمبەر(ﷺ)یان دەوت ڕاستگۆی دەست پاك، کەچی ئێستا پێی دەڵێت، ئەوان پێغەمبەر(ﷺ) یان دەکردە دادپەروەری خۆیان لە کێشەکاندا، کەچی ئێستا پزیشکی شێتی بۆ دەهێنن تا بڵێن شێت بووە، ئەوان پارە و سامان و ئەمانەتەکانی خۆیان دەبرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بیانپارێزێت بۆیان، کەچی لە لاوە پێیان دەوت پێغەمبەر شێت و بێ عەقڵە، بە ڕاستی شەرمەزاریە مرۆڤ بەو جۆرە بێ ئابروو و درۆزن و نەفام بێت.

٢- هەر چەندێك بێباوەڕان هەوڵ بدەن زیان بگەیەنن بە ئایینی خوای گەورە و موسڵمانان زیانەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان و خۆیان زیانمەند دەبن ئەوەتا ئەوان دەیانەوێت ژمارەی خۆیان زۆر بکەن و ژمارەی موسڵمانان کەم بکەن و زیماد دەنێرن تا پێغەمبەر(ﷺ) پەشیمان بکاتەوە و ئابڕووی پێغەمبەر(ﷺ) بەرن، کەچی خۆیان ئابڕوویان چوو و ژمارەی

[1] ـ ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٢).

موسڵمانەکان زیادی کرد، بەڵکو زیاد بە هەموو خەڵکی وت بێباوەڕان درۆ دەکەن و پێغەمبەر شێت نیە بەڵکو پێغەمبەری خوایە.

٣- پێویستە کاتێك قسە دەکەین بۆ کەسی بەرامبەر، بە جۆرێك قسە بکەین کە بتوانین سەرنجی ڕابکێشین بۆ لای خۆمان، ئەویش بەوەی ئایەتە بەتامەکانی قورئان و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ بڵێین تا بزانێت لە ئیسلامدا چەندە جوانی و خۆشی و زانست هەیە، بەڵکو بەو هۆیەوە موسڵمان ببێت.

٤- کاتێك دەمانەوێت کەسێك فێری ئیسلام بکەین، یان قسەیەکی جوانی فێر بکەین، دەبێت فێری ئەوەی بکەین باسی بکات بۆ کەسانی تر و پێی بڵێین ئەم قسانە بکە بۆ کەسان و خزمانی خۆت و بۆ هەر کەسێکی تر کە دەیناسێت.

پرسیار: بۆچی خەڵك فێر بکەین تا قسە بکەن بۆ خەڵکی تر؟

وەڵام: دەبێت قسە بکەین بۆ خەڵکی و ئەوانیش باسی بکەن بۆ کەسانی تر، تا بە زووی و بە پەلە ئاینی خوا و کرداری جوان بڵاوببێتەوە و کەسانی تریش بێ بەش نەبن لەو کارە جوانە یان لەو قسە چاکە، چونکە ئەوانیش وەك ئێمە مرۆڤن و دەبێت حەز بکەین چاکە بکەن تا بتوانن چاکەیان زۆر بکەن و بچنە بەهەشت.

## ئابلۆقەدانی موسڵمانان

بێ باوەڕان هەردەم وازیان نەدەهێنا لە هەوڵی ئازاردان و لە ناوبردنی موسڵمانان، سەرەتا ڕێگەی قسەکردنیان گرتەبەر تا بە قسە پەشیمانیان بکەنەوە، پاشان کەوتنە گاڵتە پێکردنیان تا وایان لێ بکەن واز بهێنن، دواتر ڕێگەی ئازاردانیان گرتەبەر و بە هەموو شێوەیەك ئازاری موسڵمانیان دەدا، هەروەك چەند نموونەیەکمان لێ خوێندەوە.

ئەمجارەیان بێباوەڕان کەوتنە دانانی پلانێکی تر بۆ موسڵمانان تا بتوانن لەم ڕێگەیەوە سەربکەون بە سەریاندا ئەویش بریتی بوو لە گەمارۆدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی، بێ باوەڕان لە نێوان خۆیاندا کۆبوونەوە و بڕیاریاندا کە نابێت هیچ کەس کڕین و فرۆشتن بکات لەگەڵ موسڵماناندا و نابێت کەسیش تێکەڵیان بکات، بۆ ئەمەش هەموویان ئیمزای ئەم بڕیارەیان

کرد و پێی ڕازی بوون، موسڵمانەکان بە ناچاری چوونە شیوێك کە پێی دەڵێن شیوی ئەبو تالیب).[١]

پرسیار: بارودۆخی موسڵمانەکان لەو ناوچەیەدا چی بوو؟

وەڵام: موسڵمانەکان لە وێ زۆر بە ستەم لێکراوی و هەژاری دەژیان، ئەوان نانیان نەبوو بیخۆن، لە گەرما و سەرمادا لەوێ بۆ خۆیان دادەنیشتن و کەس تێکەڵی نە دەکردن، بەڵێ منداڵان و جگەرگۆشە ئازیزەکان، بڕوانن بێ باوەڕان چەند خراپ و ستەمکارن، ئامادەن لەماڵی خۆیان بژین و هەموجۆرە خۆراك و نانێك بخۆن و جلی جوان بکەنە بەری خۆیان و، بە دڵی خۆیان بگەڕێن و خۆیان بپارێزن لە سەرما و گەرما کەچی دەبێت موسڵمانان برسی بن و منداڵی بچووکی موسڵمانەکان نان نەبێت بخوات و هەموویان دووچاری گەرما و سەرما بن و تا سێ ساڵی تەواو لەو بارودۆخەدا بژین.[٢]

موسڵمانەکان هێندە برسیان بوو هیچ نەبوو تا بیخۆن، بە ناچاری گەڵای دار و درەختیان دەخوارد هەندێ جار پێست و شکی ئاژەڵیان دەخوارد کە لەوێدا کەوتبوو،[٣] بێ باوەڕان ڕێگەیان نەدەدا کە هیچ کەس تێکەڵیان بێت، ژنیان لێ نەهێنن و ڕێگەش نەدەن کەس بچێت بۆ لایان هەر کەسیش بچێت بۆ لایان یان یارمەتیان بدات یان تەنانەت قسەیان لەگەڵدا بکات ئەوا سزا دەدرێت و لەگەڵ ئەویشدا تێکەڵی ناکەن،[٤] ئەبو تالیبیش لەو ماوەیەدا بە نهێنی یارمەتی موسڵمانانی دەدا بەوەی کەسانێکی دانا تا بەشەودا و بە نهێنی شت بەرن بۆ موسڵمانان، هەرچەندە خۆراکەکە زۆر کەم بوو، بەم جۆرە هەندێ کەس بە نهێنی و بەبێ ئەوەی بێ باوەڕەکان بزانن کەوتنە یارمەتی دانی موسڵمانەکان و کەمێك شتیان بۆ بردن، بەڵام بەشی نەدەکردن.[٥]

موسڵمانەکان زۆرجار بێ ئومێد و بێ تاقەت دەبوون و دەچوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و داوایان لێدەکرد یان دوعایان بۆ بکات یان شتێکیان بۆ بکات کە ڕزگاریان ببێت چونکە ئیتر

---

[١]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (١٩٨).
[٢]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٩٠).
[٣]- د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاثترة (١٨٣).
[٤]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە(٢٠١).
[٥]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٩١).

توانا و خۆڕاگریان نەماوە و تەواو بێزار بوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون دەبێت ئێوە خۆڕاگر بن و واز نەهێنن چونکە پاداشتی ئێوە بەهەشتە، مەگەر نازانن موسڵمانەکانی زوو و سەردەمی پێغەمبەرەکانی تر لە ئێوە خۆڕاگرتر بوون، ئەوان بە مشار لەت دەکران کەچی وازیان نەدەهێنا، ئێوە بۆچی هێندە پەلە دەکەن و بێزار بوون.

## خوای گەورە چارەسەر دەنێرێت

لەو کاتەدا موسڵمانان بێ هیوا بوون و وایان دەزانی ئیتر ڕزگاریان نابێت، خوای گەورە دڵی چەند کەسێك لە بێ باوەڕەکانی گۆڕی تا قبووڵی ئەو کارە نەکەن و پێکەوە ڕێککەون تا موسڵمانەکان لەو بارودۆخە سەختە ڕزگار بکەن، چونکە ئەوان هەستی مرۆڤایەتیان لە لا پەیدا بووبوو، خۆ موسڵمانیش نەبوون، هەموویان بە شەودا پێکەوە کۆبوونەوە و بڕیاریاندا یەك بگرن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە و ڕێگە نەدەن کەس و کارە موسڵمانەکانیان لەبەر چاویاندا لە برسێتیدا بمرن، کاتێك بەیانی هات یەکێك لەوانە ناوی(زوهەیر) بوو چوو بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوە و دوایی هاواری کرد خەڵکینە چۆن دەبێت ئێمە نان بخۆین و جل و بەرگی جوان لەبەر بکەین، کەچی ئەوان هیچیان نەبێت و لە برسێتیدا بمرن و کەس نەچێت بۆ لایان، ئینجا وتی سوێند بە خوا من ئەمە قبووڵ ناکەم، ئەبو جەهلیش وتی: تۆ درۆزنی و دەبێت قبووڵی بکەیت، بەڵام ئەوانی تریش وتیان زوهەیر ڕاست دەکات و تۆ درۆ دەکەیت، ئەی ئەبو جەهل ئێمە ڕازی نین بەو ڕێککەوتننامە و قبووڵمان نیە، کاتێك چوون سەیری نووسینی ڕێککەوتنەکە بکەن دەبینن هەمووی لە ناو چووە و مێروولە خواردوویەتی جگە لە ناوی (الله) نەبێت کە تیایدا بوو، بەمە موسڵمانەکان ڕزگاریان بوو و چوونەوە بۆ مەککە و لە ماڵ و شوێنی خۆیان دانیشتن.[١]

پرسیار: چی وای کرد لەو هێندە بێ باوەڕە تا ڕازی نەبن بەو ستەمە؟

وەڵام: یەکەمجار خوای گەورە وای لێ کردن و ویستی موسڵمانان ڕزگار بکات، پاشان هەستی مرۆڤایەتی وای لێ کردن بەوە ڕازی نەبن چونکە هەر کەس مرۆڤ بێت ئەوە قبووڵ ناکات.

---

[١]ـ ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٢).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- بێ باوەڕان ناتوانن بە پارە و سامان و ژن و ژنخوازی و شتی تر موسڵمان پاشگەز بکەنەوە، بەڵکو موسڵمان ئامادەیە نان نەخوات بەڵام نەبێت بە بێ باوەڕ.

٢- دەبێت ئێمە ئەو دڵسۆزی و مەردایەتیەی (ئەبو تالیب)مان لە بیر نەچێت کە چەندە باش بوون لەگەڵ موسڵماناندا، واتا مەرج نیە هەر کەس بێ باوەڕ و کافر بێت ئیتر خراپ بێت، بەڵکو هەندێ بێ باوەڕ هەن زیانیان نیە بۆ موسڵمانان و چاکن لەگەڵیاندا، بەڵام زۆربەی بێ باوەڕان خراپن.

٣- دەبێت ژیانی موسڵمانانی پێشوو و هاوەڵان بخوێنینەوە و بزانین چەندە خۆڕاگر بوون، تا ئێمەیش هێندەی ئەوان هەوڵ بدەین خۆڕاگر بین چونکە کاتێك موسڵمانەکان ماندوو بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەبێت وەك موسڵمانانی پێشوو خۆڕاگر بن.

٤- هەندێ شت هەیە ئێمە نایزانین و بەس خوا دەیزانێت، جا ئەگەر ئێمە لەگەڵ خوای گەورەدا ڕاست بکەین و خۆمان ڕابگرین، خوای گەورە ڕزگارمان دەکات، تەنانەت وا دەکات بێ باوەڕ و دوژمنەکانمان ماندوو بن و واز بهێنن.

٥- خوای گەورە موعجیزەیەکی تری نیشاندا کە بریتی بوو لەوەی هەموو لاپەڕەکە لەناو چووبوو جگە لە ناوەکەی خوای گەورە کە نووسرابوو (بەناوی خوا).

پرسیار: موعجیزە واتای چیە؟

وەڵام: موعجیزە واتا ئیشێك یان شتێك کە لە توانای مرۆڤێکدا نەبێت بیکات و تەنها خوا دەتوانێت بیکات.

بەڵێ منداڵانی ئازیز، کاتێك ژیانی ئەم هاوەڵانە دەخوێنینەوە بۆمان دەرکەوێت چەندە ڕاستگۆ بوون و لە هیچ کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ)یان بەجێ نەهێشتووە، خۆ ئەمڕۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەماوە، بەڵام فەرموودە شیرینەکانی نەماون و دەبێت فەرموودەکانی بەجێ نەهێڵین و بیان خوێنینەوە.

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

١- پێغەمبەر(ﷺ) چۆن دەستی کرد بە بانگەوازی ئاشکرا؟

٢- خەڵکەکە چیان کرد لە بەرامبەر بانگەوازی ئاشکرا؟

٣- ئەبو لەهەب چی وت بە پێغەمبەر و خوای گەورە چی فەرموو بە ئەو؟

٤- بۆچی بێ باوەڕەکان موسڵمان نەدەبوون؟

٥- ئایا بێ باوەڕان دەتوانن موسڵمانان لەناو بەرن؟

٦- دژایەتی کردنی بێ باوەڕان بۆ کێ بوو؟

٧- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان جەنگیان نەدەکرد لەگەڵ بێ باوەڕان؟

٨- بۆچی خوای گەورە موسڵمانانی ڕزگار نەکرد لەو سەختیانە؟

٩- ئایا بێ باوەڕان سوودیان بینی لە ئازاردانی موسڵمانان؟

١٠- پەند و ئامۆژگاری چی وەردەگرین لە ئازاردانی ئەبو بەکری صدیق؟

١١- خوای گەورە چۆن تۆڵەی خەبابی سەندەوە؟

١٢- بێ باوەڕان ویستیان چۆن پێغەمبەر(ﷺ) پاشگەز بکەنەوە؟

١٣- یەکەم شەهیدی ئیسلام کێ بوو؟

١٤- خوای گەورە چۆن بیلالی حەبەشی ڕزگار کرد؟

١٥- زیاد کێ بوو؟ بۆچی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)؟ دوایی چی بەسەر هات؟

١٦- موسڵمانەکان چەند ساڵ ئابلۆقە دران؟ لەسەر چی ئابلۆقە دران؟

١٧- خوای گەورە چۆن ڕزگاری کردن؟

١٨- ئەبو تالیب لەو ئابلۆقەدانەدا چۆن یارمەتی موسڵمانانی دا؟

١٩- چ پەند و ئامۆژگاریەك فێر دەبین لە ڕووداوی ئابلۆقەدانی موسڵماناندا؟

# بەشی چوارەم

# کۆچکردن

موسوڵمانان لە دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردن، چاوەڕێ بوون بزانن ژیانیان بەرەو کوێ دەچێت. ئایا ژیانیان خۆش دەبێت و بێ باوەڕەکان وازیان لێ دەهێنن؟ نەخێر بەڵکو دووبارە دووچاری سەختی و نارەحەتی و ئازاردان دەبوونەوە. بۆیە ئەمجارە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیارێکی نوێ ی دا بۆ موسوڵمانان کە ئەویش بریتی بوو لە بڕیاری کۆچکردنی موسوڵمانان بۆ حەبەشە.[1]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا موسوڵمانان کۆچ بکەن؟

وەڵام: چونکە بێ باوەڕەکان بەردەوام موسوڵمانانیان ئازار دەدا و وازیان لێ نەدەهێنان.

پرسیار: کۆچ کردن واتای چی یە؟

وەڵام: کۆچکردن واتا بەجێ هێشتنی ماڵ و شار و ناوچەی خۆت بچیت بۆ شوێنێکی تر بژیت.

*کۆچ کردن بۆ حەبەشە:-

پرسیار: موسوڵمانان بۆچی ویستیان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە؟

وەڵام:

١- چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرموو بوون دەبێت بچن بۆ حەبەشە.

٢- بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا ئاینی ئیسلام ببەن بۆ ئەو ناوچەیە و لەوێوە بڵاوی بکەنەوە بە ناوچەکانی تردا. چونکە بێ باوەڕەکان نەیاندەهێشت لە مەککە بە ئازادی ئاینی ئیسلام بڵاو بکەنەوە و بهێنرێن بۆ ناوچەکانی تری جیهان.[2]

---

[1] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٢١٤).

[2] ـ د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٩١).

٣- تا لە حەبەشەدا کەمێك بحەسێنەوە و دوور بکەونەوە لە ئازار و ئەشکەنجە.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو ناوچەکاندا حەبەشەی هەڵبژارد؟

وەڵام: چونکە

١- حەبەشە پادشایەکی چاکی دادپەروەری تێدا بوو کە ڕێزی موسوڵمانانی دەگرت.

٢- لە حەبەشە ئایینی مەسیح بڵاو بوو بوویەوە کە لە هەموو ئایینەکانی تری ئەو کاتە ڕاستتر بوو.

٣- خەڵکی حەبەشە لەگەڵ بێ باوەڕەکانی مەککە دا دژایەتییان هەبوو.[1]

پادشای حەبەشە کە پێ ی دەوترا(نەجاشی) پادشایەکی بەڕێز و دادپەروەر و چاك بوو کە ڕێگەی نەدەدا لە وڵاتەکەیدا ستەم بکرێت و خەڵکی لە خۆشیدا بوون.[2]

موسوڵمانەکان کە دە(١٠) پیاو و چوار ئافرەت بوون کە وتنە ڕێ بۆ حەبەشە و هەوڵیان دا بێ باوەڕان پێیان نەزانن، ئەوان بەردەوام چوون و هەوڵیان دەدا بە نهێنی و بە خۆ شاردنەوە بچن تا گەیشتنە حەبەشە.[3]

لەو ماوەیەدا لە مەککە چەندین کەس موسوڵمان بوون، لەوانە(حەمزەی کوڕی عبدالمطلب کە مامی پێغەمبەر(ﷺ)) بوو.(حەمزە) یەکێك بوو لە ئازاو پاڵەوانەکانی مەککە کە لەگەڵ موسوڵمان بوونیدا موسوڵمانان بەهێز بوون و بێ باوەڕەکان دەترسان ئازاری زۆری موسوڵمانان بدەن- بەڵکو بە کەمی ئازاریان دەدان.[4]

دوای ئەویش (عومەری کوڕی خەطاب) موسوڵمان بوو کە وەك (حەمزە) بەهێز بوو کەس زاتی نەبوو لە قسەی لابدات یان دژایەتی(عومەر) بکات.[5]

---

[1]- د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٩٣).

[2]- ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە( ٢١٤).

[3]- محمود شاكر: خاتم الانبياء و المرسلين. لاپەڕە( ١٠٣-١٠٦).

[4]- عبدالعزيز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (١٤٨).

[5]- عبدالعزيز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٨٦).

**پرسیار: عومەری کوڕی خەطاب چۆن موسوڵمان بوو؟**

**وەڵام: عومەری کوڕی خەطاب کەسێکی پاڵەوان بوو لەناو قوڕەیشدا. ئەو سەرەتا زۆر ستەمکار بوو. عومەر کە بە زیندوویی کچەکەی خۆی خستە ناو چاڵ و خۆڵی دا بەسەریدا و خنکاندی. هەروەها ئازاری زۆری موسوڵمانانی دەدا. ڕۆژێکیان زۆر توڕە بوو ویستی بچێت پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت بەڵام نەچوو بیستی خوشکەکەی عومەر موسوڵمان بووە بۆیە وتی با لە پێشەوە بچم بۆ خوشکەکەی خۆم. کاتێك دەچوو بۆ ماڵی خوشکەکەی دەبینێت قورئان دەخوێنێ لەگەڵ مێردەکەی و مامۆستاکەیدا. عومەر بە توندی زللەیەکی دا لە خوشکەکەی و دەمی پڕ کرد لە خوێن دای لە مێردەکەی خوشکەکەیشی پاشان کەمێك سەیری کردوو دڵی پڕ بوو وە پەشیمان بوو کە بۆچی دای لە خوشکەکەی خۆی. عومەر داوای کرد کە قورئانەکەی پێ بدەن تا بیخوێنێ بەڵام ئەوان پێیان وت: تۆ پیاوی پیسی. دەبێ خۆت بشۆیی و باوەڕ بێنی پاشان قورئانەکەت دەدەینە دەست. چونکە بێ باوەڕ نابێت قورئان بگرێتە دەست. عومەریش بە گوێ ی کردن و دوای قورئان خوێندن چووە سەر ئیسلام چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) موسوڵمان بێت.**

**لەوێ حەمزە کە عومەری بینی وای زانی هاتووە تا پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت وتی سوێند بە خوا هەر شتێ بکات دەیکوژم بەڵام کاتێ عومەر هات موسوڵمان بوو. پاشان عومەر چوو لەناو بێ باوەڕەکاندا هاواری کرد کە من موسوڵمان بووم بەوە موسوڵمانان بەهێز بوون دووبارە ژمارەیان زیادی کرد.[1]**

## پەند و ئامۆژگاری

**١- هەر کاتێ کەسانی بەهێز موسوڵمان بن ئەوا خوای گەورە دەیانکاتە هۆکاری سەرخستنی موسوڵمان و سەری بێ باوەڕانی پێ شۆڕ دەکات.**

**٢- خوای گەورە دوو پاڵەوانی مەککەی موسوڵمان کرد تا بێ باوەڕان زاتیان نەبێ ستەم بکەن.**

---

[1]. د. علي محمد الصلابي: سيرة عمر بن الخطاب، لاپەڕە (٢١-٢٢-٢٣).

٣- قورئانی پیرۆز زۆر پاك و چاكە و نابێ هەموو كەس دەستكاری بكات. بەڵكو دەبێت قورئان بە تەنها بدەین بە دەست موسوڵمانانەوە.

٤- قورئانی پیرۆز هێندە خۆشە و واتای بەهێزە هەركەسێ بیخوێنێتەوە كەمێك عەقڵی هەبێت یەكسەر موسوڵمان دەبێت، بەڵام هەركەس بێ عەقڵ و گومڕا بێت. ئەگەر هەموو قورئانیش بخوێنێتەوە هەر موسوڵمان نابێت و بێ باوەڕە.

٥- خوای گەورە ئەو كەسانە دەپارێزێ كە زۆر زانا و زیرەك و ئیماندار و لە خوا ترسن. وەك ئەوەی عومەر كەچوو بۆ كوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە وای لێكرد موسوڵمان بێت و دەست و دەم و چاوی پێغەمبەر(ﷺ) ماچ بكات.

پرسیار: ئەی موسوڵمانەكانی ناو حەبەشە چیان بەسەر هات؟

وەڵام: كاتێك موسوڵمانان هەواڵی بارودۆخی موسوڵمانانی ناو مەككەیان بیست بڕیاریان دا بچنەوە بۆ مەككە و بۆلای پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## * كۆچی دووەم بۆ حەبەشە:

كاتێ موسوڵمانان گەڕانەوە بۆ مەككە و بێ باوەڕەكان ئازاری زۆریان دانەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فرمانی دا تا بچنەوە بۆ حەبەشە ئەمجارەیان بێ باوەڕەكان ئازاری زۆری موسوڵمانانیان دا تا نەهێڵن بچن بۆ حەبەشە چونكە بیستبوویان كە لە حەبەشەدا نەجاشی ڕێزی زۆریان دەگرێت و هیچ ئازارێكیان نادات و ناهێڵێت گەورەكانی مەككەش دەستیان بگاتە لایان.[2]

پرسیار: ژمارەی ئەو موسوڵمانانە چەند بوون كە بۆ جاری دووەم كۆچیان كرد بۆ حەبەشە؟

وەڵام: ژمارەی موسوڵمانان لە جاری دووەمدا هەشتاو سێ (٨٣) موسوڵمان بوون، ئەمە جگە لەو منداڵانەی كە لەگەڵ خۆیاندا بردنیان بۆ حەبەشە.[3]

[1]. ابن كثير: البداية و النهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٩٣).
[2]. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، بەرگی یەكەم، لاپەڕە(٦٧٥).
[3]ـ د. حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام، بەرطي يەكتم، لاثترة (٧٣).

## قورەیش هەوڵی گەڕانەوەی موسوڵمانان دەدەن:

کاتێك قورەیشیەکان بینیان موسوڵمانان گەیشتن حەبەشە و لەوێ لە خۆشیدا بۆ خۆیان دەژین و هیچ کەسێك نیە ئازار و ئەشکەنجەیان بدات کەوتنە کۆبوونەوە لەنێوان خۆیاندا. بڕیاریاندا وەفدێك بنێرن بۆ لای پاشای حەبەشە تا داوای لێ بکەن ئەو موسوڵمانانەیان بیدەنەوە دەست وەفدەکە و بێباوەڕەکان کۆمەڵێك دیاری و خەلاتی زۆر و جوانیان برد لەگەڵ خۆیاندا بۆ نەجاشی ویستیان وای لێ بکەن ڕازی بێت موسوڵمانەکانیان بداتەوە دەست ئەوان چوون بۆ لای نەجاشی و دیاریان پێشکەش کردوو داوایان لێ کرد ئەو کەسانەی ڕایان کردووە بۆ ولاتەکەی بیانداتەوە بە گەورەکانی مەککە. ئەوان وتیان ئەو کەسانە تاوانبارن لە مەککەدا ئاژاوەیان ناوەتەوە ڕایان کردووە بۆ لای تۆ بەلام نەجاشی بە قسەکانیان هەڵنەخەڵەتا و ناردنی بەشوێن موسوڵمانەکاندا کاتێك قسەی کرد لەگەڵ موسوڵمانەکاندا و گوێی گرت لە قسەی موسوڵمانەکان سەیری کرد موسوڵمانەکان ئاژاوە گێڕ نین و چاکن. بەڵکو بێ باوەڕەکانی مەککە ئاژاوە گێڕ و خراپن و ستەمیان کردووە لە موسوڵمانانی بێ تاوان.[١]

نەجاشی کاتێك ئەو بارەی موسوڵمانانی بینی بڕیاری دا موسوڵمان بێت و باوەڕ بهێنێت بە پێغەمبەرایەتی موحەمەد(ﷺ) بەلام ئەوە بە نهێنی موسوڵمان بوو. بە ئاشکرا ڕای نەگەیاند کە موسوڵمان بوو.[٢]

پرسیار: بۆچی نەجاشی بە ئاشکرا نەیوت کەمن موسوڵمان بووم؟

وەلام: چونکە ئەگەر بە ئاشکرا بیوتایە. ئەوا خەڵکەکەی لێی هەڵدەگەڕانەوە. ئەویشیان لادەبرد موسوڵمانەکانیشیان دەدایەوە دەست پیاوەکانی مەککە. پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی دەدات کە نەجاشی موسوڵمان بووە. چونکە کاتێ نەجاشی مرد پێغەمبەر(ﷺ) لە دوورەوە نوێژی مردووی کرد لەسەر نەجاشی و دووعای خێری کرد بۆ نەجاشی،[٣] ئێمەش وەك پێغەمبەر(ﷺ) دوعای خێر دەکەین بۆ نەجاشی و دەڵێین خوایە گیان بیخەیتە بەهەشت.

---

[١]- ابن هشام: السیرة النبویة، لاثقرة(٢٩٣).

[٢]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاثقرة(١١٧-١٢٠).

[٣]- د. علي محمد الصلابي: السیرة النبویة، لاپەڕە(٢٠٠).

## پەند و ئامۆژگاری

١- دووبارە دەبینین هەموو جارێك بێ باوەڕان كۆ دەبنەوە تا پیلان دابنێن بۆ لەناو بردنی موسوڵمانان یان وا بكەن كە موسوڵمانان زیاد نەكەن و سەرنەكەون كەچی هەموو جارێ تیایدا خۆیان سەرشۆڕ دەبن و موسوڵمانەكان سەردەكەون بەڵام بێ باوەڕەكان ژێر نابن هەمتر دەست پێ دەكەنەوە. خوای گەورەش سەر شۆڕیان دەكات.

٢- نابێت لە خۆمانەوە بڕیار بدەین ئەگەر هاتوو كەسێك هات بۆ لامان و قسەیەكی كرد وتی ئەو كەسە وایە و وایە. نابێ ئێمەش یەكسەر باوەڕی پێ بكەین بەڵكو دەبێت بڕۆین پرسیاری بكەین بزانین ڕاستەكەی چۆنە هەروەك سەیر دەكەین كاتێك بێ باوەڕان باسی موسوڵمانەكانیان كرد بۆ نەجاشی نەجاشی باوەڕی پێ نەكردن و ناردی بەشوێن موسوڵمانەكاندا تا بزانێت ئەو قسەی پیاوەكان دەڵێن ڕاستە یان درۆیە.

٣- دەبێت موسوڵمان كاتێ گفتوگۆ دەكات لەگەڵ كەسێكدا ڕاستی و دروستی بڵێت نەوەك لەبەر ئەوەی دوژمنەكانی ڕازی بكات قسەی ناڕاست بكات یان ئەو قسانە بشارێتەوە كە دەبێت بیكات. چونكە موسوڵمانەكان چی ڕاست بوو باسیان كرد بۆ نەجاشی.

٤- بۆمان دەردەكەوێت كە دروستە موسوڵمان ماڵ و شار و وڵات و نیشتیمانی خۆی بەجێ بهێڵێ ئەگەر ستەمكاران ستەمیان لێ كرد و نەیتوانی بە خۆشی بژێت.

٥- ئەگەر كەسێكی موسوڵمان بزانێ ئەگەر خەڵكی تر بزانن ئەو موسوڵمان بووە دەیكوژن. ئەوا دەتوانێت پێیان نەڵێ موسوڵمان بووم. بە نهێنی نوێژ بكات و ڕۆژوو بگرێت.

٦- دەبێ ئێمە هەركەسێكمان خۆش بوێت موسوڵمان بێت. دوعای خێری بۆ بكەین چونكە پێغەمبەر(ﷺ) نەجاشی خۆش ویست و دوعای خێری بۆ كرد.

پرسیار: بۆچی بێ باوەڕان دەیانویست موسوڵمانان نەچن بۆ حەبەشە؟

وەڵام: چونكە بێ باوەڕان دەترسان ئەگەر موسوڵمانان بچن بۆ حەبەشە لەوێوە ئایینی ئیسلام بڵاو بكەنەوە بۆ ناوچەكانی تر چونكە ئەوان دەیانزانی موسوڵمان بچێت بۆ هەر

ناوچەیەك دەتوانێت باسی ئاینی ئیسلام بكات ئاینی ئیسلامیش هێندە چاك و جوانە خەڵكەكە بیبیستن زوو وەریدەگرن. هەروەك چۆن خەڵكێكی زۆر لە مەككەدا موسوڵمان بوون.

## * غەمباری پێغەمبەر (ﷺ):

لەو ماوەیەدا كە موسوڵمانان تازە ڕزگاریان بوو بوو لە ئابلوقەدان و هەندێكیان چوو بوون بۆ حەبەشە و خۆشییان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) توشی دەردەسەری یەك هات كە دڵی پیرۆزی غەمبار كرد و جارێكی تر پێغەمبەر گیانمان بێ ناز كەوت لەو ماوەیەدا دوو كەسی نزیك و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) مردن كە هەردووكیان زۆر پاڵپشتی پێغەمبەر(ﷺ) یان دەكرد و یارمەتییان دەدا لە كارەكەیدا. ئەو دوو كەسەش ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و خەدیجەی ژنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون كاتێ ئەو دووانە مردن پێغەمبەر(ﷺ) تەواو بێ تاقەت بوو و خەفەتی پێ دەخوارد چونكە ئەو دووانە هەمیشە لە دەوری پێغەمبەر بوون و دڵنەواییان دەدایەوە.

پرسیار: ئەبو تالیب چۆن مرد؟ ئایا ئەبو تالیب باوەڕی هێنا؟

وەڵام: ئەبو تالیب تەمەنی زۆر بوو بوو پیر بوو. جا كاتێ كەوتە سەرە مەرگەوە خەریك بوو بمرێ. خزم و كەس و هاوڕێكانی لە دەوری كۆبوونەوە. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دەیوت:- مامە گیان تەنها بڵێ (لا إله إلا الله) با لە ڕۆژی دواییدا شایەتیت بۆ بدەم بەڵام ئەبو تالیب دەبوت:- ڕۆڵە گیان ئەگەر لەبەر قسە و بۆڵە بۆڵی قوڕەیش نەبوایە هەر دەموت لەو كاتەدا بێ باوەڕان لە دەوروپشتیدا بوون و زوو زوو پێیان دەوت هەڵنەخەڵتێ ی بە قسەكانی محمد و واز نەهێنی لە ئاینی باو و باپیرانت. بۆیە ئەبو تالیب تا مرد باوەڕی نەهێنا و بە بێ باوەڕی مرد و پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خەفەتی بۆ خوارد.[1] پێغەمبەر(ﷺ) داوای كرد لە خوا تا لە ئەبو تالیب خۆش بێت بەڵام خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ) ی فەرموو! كە لێی خۆش نابێت بەڵام سوكترین سزای دەدات لە ڕۆژی دواییدا.[2]

پرسیار: سوكترین سزا چیە لە ڕۆژی دواییدا؟

---

[1] ابن كثیر: البدایة و النهایة، بەرگی(٢)، بەشی (٣)، لاپەڕە(٨٩).

[2] - إبن إسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٦٦-٢٦٩).

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت سوکترین سزای ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە جووتێ نەعل دەکەیتە پێت و سەرت لە گەرمیدا دەکوڵێت واتە ئەبو تالیب هەرچەندە چاك بوو لەبەر ئەوەی کە باوەڕی نەهێنا بە ئایینی ئیسلام و نوێژی نەدەکرد و ڕۆژووی نەدەگرت، دەبێ بەو جۆرە سزا بدرێت.[1]

پرسیار: ئەی خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن کۆچی دوایی کرد؟

وەڵام: خەدیجە خوای لێ ڕازی بێت لە دوای مردنی ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش مرد و پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها مایەوە، تەنها خوای هەبوو کە پاڵپشت و دالدەی بێت و لە تەنگانە و سەختیدا دڵنەوایی بدات.[2]

## پەند و ئامۆژگاری

١- ئێمەی موسڵمان دەبێت چاوەڕێ بین دوچاری ناڕەحەتی و سەختی ژیان ببین و کەس و کار و خزم و نزیکەکانیشمان بمرن، دەبێت ئێمە لەو کاتەدا سوپاسی خوای گەورە بکەین، چونکە هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە و دەبێت بمرین، پێغەمبەر(ﷺ)یش دایك و باوك و باپیرە و مام و ژن و کوڕەکانی مردن، کەچی خۆڕاگر بوو و سوپاسی خوای گەورەی دەکرد و وازی نەدەهێنا لە ئاینی ئیسلام.

٢- هاوڕێی خراپ دەبێتە مایەی زیان و بەدبەختی دنیا و دوارۆژ، هاوڕێی خراپ مرۆڤ فێری تاوان و هەڵە و خراپە دەکات، ئەو لە سەرەتاوە وەك کەسێکی چاك خۆی نیشان دەدات کەچی دوایی هاوڕێکەشی فێری خراپە دەکات، ئەبو تالیب چاکەی زۆری دەکرد، بەڵام هاوڕێ خراپەکانی هەموو جارێك پەشیمانیان دەکردەوە و نەیان دەهێشت موسڵمان ببێت، تەنانەت لەکاتی سەرەمەرگیشدا وازیان لێ نەدەهێنا و تەنانەت نەیان دەهێشت بڵێت (لا إله إلا الله).

٣- هەر کەس چاکەمان لەگەڵدا بکات دەبێت لەبیرمان نەچێت، هەر کەسیش ئێمەی خۆش ویست و لەگەڵمان باش بوو، ئێمەش دەبێت خۆشمان بووێت و لەگەڵیدا چاك بین، وەك

[1] ـ ابن تيمية: الجموعة الفتاوى، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٨٩).
[2] ـ ابن تيمية: الجموعة الفتاوى، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٩٠).

چۆن ئەبو تالیب لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا چاك بوو، پێغەمبەریش ئەوی خۆش دەویست و حەزی دەکرد موسڵمان بێت تا بچێتە بەهەشت.

٤- دەبێت ئێمە خۆمان بپارێزین لە سزای سەختی دۆزەخ، چونکە سزای دۆزەخ زۆر سەختە و ئەگەر بچینە دۆزەخەوە خۆشی و کامەرانی نابینین و هەمیشە ئازار و ناڕەحەتی دەچێژین وەك دەبینین سووکترین سزای دۆزەخ ئەگەر ئەوەندە سەخت و ناڕەحەت بێت، دەبێت سزای سەختی دۆزەخ چۆن بێت، بۆیە با هەموو جارێك نزای خێر بکەین و لە خوای گەورە بپاڕێینەوە بمانپارێزێت لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتی بەرینەوە.

## پێغەمبەر(ﷺ) دەچێت بۆ تائیف (طائیف):

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا ئاینی ئیسلام بڵاو بکاتەوە و بە هەموو شوێنێکدا، هەروەها دەیویست ئاینەکەی تەنها لە مەککەدا نەبێت چونکە ئەو ئاینە بۆ هەموو جیهان و مرۆڤایەتیە، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بڕوات بۆ تائیف کە شارێکە لە دەوروبەری مەککەدا، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ ئەوێ تا باسی ئاینی ئیسلامیان بۆ بکات، خەڵکەکە گوێیان بۆ گرت، بەڵام دوای ئەوە کەوتنە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(ﷺ) و منداڵەکانیان کۆکردەوە پێیان وتن بەردبارانی پێغەمبەر بکەن.[1]

منداڵەکانیش نەیان دەزانی ئەوە گوناهە، بۆیە دەکەوتنە بەرد وەشاندن بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئازاری پێغەمبەر (ﷺ)یان دەدا، هەر چۆن بێت نەزانە ئەگەر ئاینی ئیسلام فێری شتی نەکات، ئەو منداڵانەش فێری نوێژ و قورئان و دوعا و چاکەکردن نەبووبوون، بۆیە بەردیان دەوەشاند بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و دەست و قاچی پێغەمبەر(ﷺ) خوێناوی بوو و ئازارێکی زۆری پێ دەگەیشت.[2]

پرسیار: ئایا ئەو منداڵانە تاوانبارن، کە پێغەمبەر(ﷺ)یان بەردباران کرد؟

وەڵام: ئەو گەورانە تاوانبارن کە منداڵەکانیان هاندا کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرد باران بکەن. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست بگەڕێتەوە بۆ مەککە، لە ڕێگەدا لە لای باخێکدا لایدا،

[1]. عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (١٧١).
[2]. عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٩٥).

یەکێك لە هاوەڵە بەرزەکانیشی لەگەڵدا بوو کە ئەویش دەم و چاو و دەستی خوێناوی بووبوو، چونکە ئەو خۆی دەدایە بەر بەردەکان تا بەردەکان بەر پێغەمبەر(ﷺ) نەکەون، کاتێك لای باخەکەدا دانیشت خاوەنی باخەکە سەیری کردن و دڵی پڕ بوو بۆیە کەمێك میوەی بۆ هێنان، بەڵام خۆی موسڵمان نەبوو.[1]

لەو کاتەدا فریشتەکانی خوای گەورە دابەزین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێیان فەرموو ئەگەر تۆ ڕازیت با ئەو دوو شاخە بدەین بە یەکدا تا هەموو تائیف لەناو بەرین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو، فەرمووی ئەوانە هەژار و نەزانن ئەگەر بیانزانیبایە وایان نەدەکرد، خوایە گیان بەڵکو منداڵەکانی ئەمانە باش بن و دوابی باوەڕ بهێنن.[2] ئەگەر بهاتایە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بکردایە بە لەناوبردنی شاری تائیف ئەوا هەموو خەڵکەکەی لەناو دەچوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤەکانی خۆش دەوێت حەز ناکات کەس بچێتە دۆزەخەوە و هەموویان بچنە بەهەشتەوە، بەڵام هەندێ مرۆڤ هەن خۆیان حەز ناکەن بچنە بەهەشتەوە و تاوان دەکەن و دەچنە دۆزەخ، دواتر پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵە بەڕێزەکەی گەڕانەوە بۆ مەککە، لەوێ بێباوەڕەکان زۆر خۆشیان بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیتوانیوە موسڵمانیان بکات و کەوتنە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(ﷺ)و پێی پێ دەکەنین و ئازاری پێغەمبەر(ﷺ)یان دەدا.[3]

**تێبینی**: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بوو بۆ مەککە، ئەو کاتە کۆمەڵێك جنۆکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕیان پێ هێنا و موسڵمان بوون بڕیاریاندا بچن بۆ لای جنۆکەکانی تر و باسی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان بۆ بکەن.[4]

پرسیار: جنۆکە کێن؟

وەڵام: جنۆکە دروستکراوی خوای گەورەن کە لە ئاگر دروست کراون ئێمەی مرۆڤ ئەوان نابینین بەڵام ئەوان ئێمە دەبینن، ئەوانیش موسڵمان و کافریان هەیە.[1]

---

[1]ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء و المرسلین. لاپەڕە( ١٤٣).
[2]ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە(٣٦٥-٣٦٦).
[3]ـ د. علي محمد الصلابي: السیرة النبویة، لاپەڕە (٢١٤).
[4]ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(p)، لاپەڕە (١٨٠).

## پەند و ئامۆژگاری

١- پێویستە ئێمەی موسڵمان بچینە هەر شوێنێك باسی ئاینی ئیسلام بکەین، ئەگەر چووین بۆ شارێکی تر بۆ لای خزمێکمان یان بۆ لای کەسێك دەبێت قسەی چاکیان بۆ بکەین و نەترسین لەوەی خەڵك گاڵتەمان پێ بکەن، چونکە خوای گەورە لەگەڵمانە.

٢- زۆر جار کەسە گەورەکان ئەگەر خراپ و ستەمکار بن منداڵەکان فێری گوناهو خراپە دەکەن، بۆیە دەبێت مناڵی ژیر و عاقڵ گوێ نەگرێت لەهەموو کەسێکی گەورە، بەڵکو دەبێت بزانێت کامیان باوەڕدار و چاکەکارە، گوێ لەوەیان بگرێت، چونکە گەورەی چاك منداڵ فێری کاری چاکە و پیاوەتی دەکات.

٣- دەبێت ئێمە زۆر خۆڕاگر و بەسۆز بین و ئەگەر کەسێك خراپەیەکی لەگەڵدا کردین نابێت یەکسەر لێی بدەین و دوعای خراپی لێ بکەین، بەڵکو دەبێت خۆڕاگر بین و دوعا بکەین و بڵێین خوایە ڕێگای ڕاستی نیشان بدەیت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دوعای خێری بۆ بێباوەڕەکانی تائیف کرد تا خوای گەورە ڕێگای ڕاستیان نیشان بدات.

٤- دەبێت ئێمە ڕێزی زانا و موسڵمانە چاکەکان بگرین هەروەك ئەو پیاوەی ڕێزی پێغەمبەر(ﷺ)ی گرت و میوەی بۆ برد.[1]

## ڕووداوی ئیسرا و میعراج

ڕووداوی ئیسرا و میعراج بریتیە لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ فریشتەی خوادا چوو بۆ قودس و لەوێشەوە چوو بۆ ئاسمان بۆ لای خوای گەورە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەوەدا بوو کە جوبرائیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو دەبێت بێت لەگەڵمدا تا بچین بۆ قودس و لەوێوە بچین بۆ لای خوای گەورە.[2] جوبرائیل و پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها نەچوون، بەڵکو فریشتەیەکیشیان لەگەڵدا بوو کە باڵی هەبوو،

---

[1] ـ محمد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، لاپەڕە (١٠٤).
[2] ـ ابن كثير: البداية و النهاية، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٦٥).

پێغەمبەر(ﷺ) سواری ئەو فریشتەیە بووبوو ناوی ئەو فریشتە بەڕێزە (بوراق) بوو کە پێغەمبەر(ﷺ)ی برد بۆ قودس و لەوێوە بۆ ئاسمان.

پرسیار: قەدس کوێیە؟ بۆچی شوێنێکی گرنگ و بە نرخە؟

وەڵام: قودس شوێنێکە لە فەلەستین کە یەکەمجار ئەوێ قیبلەی موسڵمانان بووە، گۆڕستانی زۆربەی پێغەمبەران لە قودس دایە، هیچ کەس ناتوانێت بچێت بۆ ئاسمان تەنها لەسەر قودسی پیرۆزەوە نەبێت، بەڵام ئێستا داگیرکەرە جولەکەکان قودسیان گرتووە و موسڵمانان چاوەڕێن بتوانن رزگاری بکەنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە قودسدا نوێژی کرد لەسەر پێغەمبەران و لەوێوە بەرێکەوت بەرەو ئاسمان کە جوبرائیلیش لەگەڵیدا بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بەرەو ئاسمان کۆمەڵێک شتی سەرسوڕهێنەری بینی کە جوبرائیل باسی ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی بۆ کرد.[1]

لەو ڕووداوانە:

١- جوبرەئیل قاپێک شیر و قاپێک عارەقی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی یەکێکیان هەڵبژێرە، پێغەمبەر(ﷺ)یش شیرەکەی هەڵبژارد، جوبرەئیل فەرمووی کارەکەت ڕاست بوو.

٢- جوبرەئیل هەموو پێغەمبەرەکانی یەك یەك نیشانی پێغەمبەر(ﷺ) دا، سەرەتا بردی بۆ لای ئادەم[2] و پێی وت ئەوە باوکە گەورەتە، جوبرەئیل و پێغەمبەر(ﷺ) هەردووکیان سەلامیان لێ کرد و، کە هەمتر چوونە سەر گەیشتن بە هەردوو پێغەمبەر(یحی و عیسا) (سەلامی خوایان لەسەر بێت) سەلامیان لێ کردن و ئەوانیش وەڵامیان دانەوە و وتیان سەلام لە برای چاك و ڕێك و پێکمان. دواتر بە هەمان شێوە هارون و موسا و ئیبراهیم و پێغەمبەرەکانی تری بینین، پاشان جوبرەئیل چەند نمونەیەکی بەهەشتی نیشانی پێغەمبەر(ﷺ) دا.[3]

---

[1] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٣٠٩).
[2] ـ د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٢٢٤-٢٢٥).
[3] ـ ابن كثير: البداية و النهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٢٥).

٣- خوای گەورە لەو شەوەدا بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو دەبێت موسڵمانان لە ڕۆژێکدا(٥٠) نوێژ بکەن، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەر موسای بینی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) پێی وت: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانان ناتوانن ئەوەندە نوێژ بکەن، بڵێ بە خوای گەورە با کەمی بکاتەوە بۆتان، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوەندە چوویەوە بۆ لای خوای گەورە تا (٥٠) نوێژەکەی کرد بە (٥) نوێژ، خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو: من لە قسەی خۆم پاشگەز نابمەوە، ئێوە (٥) نوێژم بۆ بکەن بەڵام پاداشتی(٥٠) نوێژتان بۆ دەنووسم.[١]

٤- پێغەمبەر(ﷺ) کۆمەڵێك خەڵکی زۆری بینی کە سزا دەدران کاتێك پرسیاری کرد لە جوبرەئیل بۆچی سزا دەدرێن؟ جوبرەئیل فەرمووی لەبەر ئەوەی هەر یەکێکیان تاوانێکیان کردووە، یەکێکیان غەیبەتی کردووە، یەکێکیان داوێن پیسی کردووە، یەکێکیان پارەی حەرامی خواردووە، ئەوانی تریش گوناهی تریان کردووە، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دۆزەخی بینی و سەیری کرد زۆربەی ئافرەتانن.[٢]

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر چوویە دەرەوە لەوێ لەگەڵ خوای گەورەدا قسەی کرد ئینجا دوایی هاتەوە بۆ مەککە و لەوێ ئەم ڕووداوەی باس کرد بۆ خەڵکەکە، کەچی خەڵکەکە هەموو گاڵتەیان پێ دەکرد و موسڵمانانیش خەریك بوو باوەڕی پێ نەکەن، تا ئەوەی وتیان ئەبو بەکر سەیرکە پێغەمبەر چی دەڵێت؟ ئەبو بەکر وتی چی دەڵێت؟ وتیان پێغەمبەر دەڵێت ئەمشەو چووم بۆ ئاسمان و گەڕاومەتەوە، ئەبو بەکر وتی: دەی ڕاست دەکات ئەوە پێغەمبەری خوایە، بۆیە ناوی ئەبو بەکر نرا بە ئەبو بەکری ڕاستگۆ، چونکە یەکسەر باوەڕی کرد بەو قسەیە.[٣]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بە بێباوەڕەکانی فەرموو ئەمشەو کۆمەڵێك کەسم بینی کە ئاژەڵیان پێ بوو هاتن بەرەو ئێرە، بڕۆن سەیرکەن ئێستا لەو شوێنەدان، کاتێك چوون سەیریان

[١]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٩٩).
[٢]- ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە(٣٥٥).
[٣]- رواه مسلم.

کرد بینیان پێغەمبەر(ﷺ) ڕاست دەکات، بەڵام هێندە کەللە شەق و نەزان بوون هەر باوەڕیان نەهێنا.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- خوای گەورە هەمیشە پاڵپشتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات و دڵنەوایی دەداتەوە، با کەس و کاری پێغەمبەر(ﷺ) مردبن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستێکی هەیە کە هەرگیز نامرێت کە ئەویش خوای گەورە و میهرەبانە کە پێغەمبەر(ﷺ)ی خۆش دەوێت، وەك چۆن بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان بۆ لای خۆی.

٢- پێغەمبەر(ﷺ) لەو گەشتەیدا کە بە شەو کردی زانیاریەکی زۆری وەرگرت و کۆمەڵێك شتی بینی کە دواتر باسی کرد بۆ موسڵمانان ئەوانیش گێڕاویانەتەوە بۆ ئێمە تا ئێمەش سوود وەربگرین لەو زانیاریانە.

٣- خوای گەورە ئێمەی زۆر خۆش دەوێت و نایەوێت ئێمە زۆر ماندوو بین، بەڵکو پەنجا نوێژی بۆ کردین بە پێنج نوێژ کەچی چاکە و خێری پەنجا نوێژەکەمان بۆ دەنووسێت، وەك ئەوەی کرێکارێك لە جیاتی ٥٠ سەعات پێنج سەعات ئیش بکات بەڵام دوایی پارەی پەنجا سەعاتەکە وەربگرێت.

٤- پێغەمبەری ئازیزمان پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو پێغەمبەرەکانی تریش ئێمەیان خۆش دەوێت وەك دەبینین پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە بیری ئێمەدا بووە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو ئەوە بۆ موسڵمانان سەختە بڕۆ با خوای گەورە کەمی بکاتەوە.

٥- ئەگەر دوو شتیان خستە بەر دەستمان وتیان یەکێکیان هەڵبژێرە دەبێت ئێمە چاکەکە هەڵبژێرین و بیر بکەینەوە و بزانین کامیان چاك و حەڵاڵە.

٦- دەبێت هەر شتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ئێمە یەکسەر باوەڕی پێ بکەین، نەوەك گومانمان هەبێت لێی چونکە کاتێك بە ئەبو بەکری صدیقیان وت: پێغەمبەر وتوویەتی

---

[1]. ابن هشام: السيرة النبوية، لاپەڕە(٣٤٨).

من ئەمشەو چووم بۆ ئاسمان و هاتوومەتەوە، ئەبو بەکر هیچ گومانێکی نەبوو یەکسەر وتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاست دەکات.

٧- بێباوەڕان زۆر نەفام و لاسارن و بە هیچ شتێك باوەڕ ناکەن تەنانەت ئەگەر بەڵگەی ڕاست و دروستیشیان بۆ بهێنینەوە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگەی بۆ هێنانەوە کە بڕۆن خەڵکەکە و ئاژەڵەکان ببینن، کاتێك چوون بینیان ڕاستە، کەچی باوەڕیان نەهێنا و لە جیاتی ئەوەدا وتیان پێغەمبەر جادووکەرە و بە سیحر و جادوو ئەو شتانەی زانیووە.

## * پێغەمبەر (ﷺ) دەچێت بۆ لای هۆزەکان:

پێغەمبەر(ﷺ)بڕیاریدا بچێت بۆ لای هۆزەکان، تا یەکێك لەو هۆزانە پشتگیری بکەن و نەهێڵن بێباوەڕانی تر ئازاری بدەن و دژایەتی بکەن، بەڵام ئەو هۆزانە هەموویان کەوتنە بەرپەرچدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئامادە نەبوون پشتگیری بکەن، ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب (لەعنەتی خوایان لێ بێت) هەمیشە گاڵتەیان دەکرد بە پێغەمبەر(ﷺ) و نەیان دەهێشت هیچ کەسێك یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بدات و پەشیمانیان دەکردەوە، پێغەمبەر(ﷺ)یش بە تاریکی شەودا دەچوو بۆ لای هۆزەکان تا ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب پێی نەزانن، هەروەها لەگەڵ خۆیدا هاوەڵانی وەك ئەبو بەکر و عەلی دەبردن.[1]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خۆیدا هاوەڵانی دەبرد و دەچوو بۆ لای هۆزەکان؟

وەڵام: بۆ ئەوەی هۆزەکان وا نەزانن پێغەمبەر(ﷺ) خۆی تەنهایە و قسەی لەگەڵ بکەن لە کۆتاییدا پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوت و توانی پاڵپشتی هەبێت و بێباوەڕانیش نەیان توانی ڕێی لێ بگرن.

### * پەند و ئامۆژگاری:

١- پێغەمبەر(ﷺ) داوای یارمەتی لە هۆزەکان کرد تا ئەوەی بێباوەڕەکان تەواو ئازاریان دەدا و نەیان دەهێشت بانگەواز بکات بۆ ئاینی ئیسلام بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کە داوای لە کۆمەڵێك هۆز کرد تا یارمەتی بدەن بانگەواز بکات بۆ ئاینی ئیسلام.

[1] ـ د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٢٢٦).

٢- دەبێت کاتێك ئیشێکی گرنگ دەکەین بە نهێنی بیکەین و نەهێڵین دوژمنانمان پێمان بزانن تا ئیشەکەمان تێك نەدەن بە تایبەت لە شەودا کە خەڵك خەوتووە یان ماندوون یان تاریکە

٣- نابێت خۆمان تەنها بین لە گەشت و سەیران و ڕۆیشتنماندا، چونکە ئەو کات خەڵکی وا دەزانن تەنهاین و دوژمنان هەوڵ دەدەن زیانمان پێ بگەیەنن، بەڵکو چاك وایە چەند کەسێك پێکەوە بچین بۆ شوێن و یەکێکمان بکەین بە سەرکردەی ئەوانی ترمان چی وت بە گوێی بکەین، پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو بەکر و عەلی دەبردن لەگەڵ خۆیدا تا تەنها نەبێت و خەڵکی وا نەزانن خۆی تەنهایە.

پرسیار: گرنگترین ئەو هۆزانە کێ بوون؟

وەڵام: گرنگترین ئەو هۆزانە هۆزی (بەنی عامر) و ( بەنی شەیبان) بوون.[١]

## * موسڵمان بوونی چەند کەسێکی مەدینە:

مەککە لەبەر ئەوەی کەعبەی تێدا بوو،ساڵانە خەڵك دەچوو بۆ مەککە بۆ سەردانی کەعبە، خەڵکی لە هەموو ناوچەیەکەوە ڕوویان دەکردە ئەوێ، یەکێك لەو ناوچانەش مەدینە بوو، مەدینە شارێکی دووری مەککەیە و شارەکە پڕە لە دارخورما و چوار دەوری بەردەڵان و بەرز و نزمیە، ناوچەکە ناوچەیەکی بە پیت و دەوڵەمەندە و خەڵکی سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون، لەو شارەدا ئاینی جۆربەجۆر هەبوو، بەڵام جوولەکەکان لە هەموویان زیاتر شانازیان دەکرد بە خۆیانەوە و دەیان وت بەم زووانە پێغەمبەرێك دێت کە سەر بە ئێمەیە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ لای ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ سەردانی کەعبە باسی ئاینی ئیسلامی بۆ دەکردن هانی دەدان تا باوەڕ بهێنن بەو ئاینە و موسڵمان بن، بەڵام بێباوەڕەکان هەر لە دوورەوە لەسەر ڕێ ڕادەوەستان و هەر کەس دەهات دەیان وت پیاوێك هەیە ناوی پێغەمبەرە، ئەو پیاوە شێت و نەزانە و گوێی لێ نەگرن، کاتێك هەندێ کەسی ناو مەدینە

---

[١]. ابن الاثیر: الکامل في التاریخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە(٦٨٥-٦٨٨).

هاتن بۆ ئەویێ و هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ)یان بیست وتیان دەچین بۆ لای بزانین چی دەڵێت کاتێك چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و قسەیان لەگەڵدا کرد دڵیان چوویە سەر ئیسلام و باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ) پێکەوە لە تاریکی شەودا کۆبوونەوە و بڕیاریان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئاینی ئیسلام بە جوانی وەربگرن و جێبەجێی بکەن و بە خەڵکی تری شارەکەیشیان بڵێن هەروەها بڕیاریان دا کە ساڵێکی تریش بێنەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئەم کارەیان بە نهێنی کرد و نەیانهێشت بێباوەڕان پێیان بزانن، ئەمە پێی دەوترێت بەڵێنی یەکەمی عەقەبە.[1]

پرسیار: ژمارەی ئەو کەسانە چەند بوو کە لە یەکەم بەڵێندا ئامادەبوون؟

وەڵام: ژمارەی ئەو کەسانە دوانزە کەس بوو کە خەزرەجیەکان و ئەوس بوون.[2]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- نابێت ئێمەی موسڵمان بە هیچ جۆرێك واز بهێنین لە بانگەواز و هەر کەسێك بناسین کە بزانین گوێ دەگرێت، دەبێت قسەی چاکی بۆ بکەین تا سوودی لێ وەربگرێت.

٢- ئەگەر بێباوەڕەکان درۆ بکەن و قسەی بێتام و ناشرینمان پێ بڵێن و لای خەڵك وا نیشان بدەن کە ئێمە خراپین، ئەوا خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوە و ئێمە سەردەخات.

پرسیار: ئەی لە مەدینە چی فێر دەبوون؟

وەڵام: لە مەدینەدا لە لای هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) ئاینی ئیسلام فێر دەبوون کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردبووی لەگەڵیاندا، ناوی (موصعەب) بوو.[3]

---

[1] ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء و المرسلين. لاپەڕە( ١٤٥-١٤٩).
[2] ـ عبدالعزيز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٠٩).
[3] ـ ابن هشام: السيرە النبويە، لاپەڕە(٣٧٣).

## * بەڵێنی دووەمی عەقەبە:

ئەو شەش کەسە بەڕێزە دوای ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا کەوتنە قسە و لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون و گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان لەوێ کەوتنە بانگەواز کردن بۆ ئایینی ئیسلام و خەڵکیان بانگ دەکرد تا موسڵمان بن، ئەوان دەیان ویست پێشی جولەکە بدەنەوە و زووتر ئەوان موسڵمان بن، ئەوان هەر زوو ڕقیان لە دار و بەرد و بت پەرستی بوو، چونکە هیچ سوودێکی نەبوو، ئەمجارەیان کە ساڵی داهاتوو هاتەوە ژمارەی موسڵمانەکانی مەدینە زیادی کرد و تێکەڵ بوون لەگەڵ هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج، ئەو دوو هۆزە زۆر دژی یەکتر بوون، هەمیشە پێکەوە دژی یەکتر جەنگیان دەکرد، بەڵام بە هۆی ئیسلامەوە بوون بە دۆستی یەکتر.

ئەمجارەیان موسڵمانەکان زۆر بوون و ژمارەی پیاوەکان (٧٠) کەس بوو ئەوان لە دۆڵی عەقەبەدا چاوەڕوانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و لەوێ لەگەڵیدا دانیشتن و لەوێ بڕیار و بەڵێنیان دا تا لە خۆشی و ناخۆشی و سەختی و ئاسایش و لە هەموو کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا بن و واز نەهێنن لە ئایینەکەی، هەوڵ بدەن ئایینی ئیسلام سەر بخەن، ئەوان بەڵێنیان دا پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆیان و ماڵ و سامانیان زیاتر بپارێزن، دوایی بە دڵێکی فراوانەوە و بە خۆشی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ)یان بینیوە بڕیاریان دا بگەڕێنەوە بۆ مەدینە.[١]

ئەو کات چوونەوە بۆ مەدینە و دەستیان کرد بە بانگەواز کردن بۆ ئایینی خوا و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان زیادی کرد تا ئەوەی زۆربەی خەڵکی مەدینە خەریك بوو موسڵمان دەبوون.

## * پەند و ئامۆژگاری:

کاتێك بەڵێن دەدەین، قسەیەك دەکەین، دەبێت خاوەنی قسەکە بین و وازی لێ نەهێنین و لەسەری بەردەوام بین، نەوەك بەڵێنەکەمان واز لێ بهێنین و وا بزانین گوناه نیە، سەیرکەن ئەو موسڵمانانەی مەدینە چۆن وازیان نەهێنا لە بەڵێنەکەیان و بەردەوام هەوڵی خۆیان دەدا و

[١]. د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٢٤٠).

ژمارەیان زۆر زۆر دەبوو، ساڵی داهاتوو هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێیان ڕاگەیاند کە پێغەمبەر(ﷺ)یان لە خۆیان و لە دایك و باوك و هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت.

## * کۆچکردنی موسڵمانان بۆ مەدینە:

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا کە هەموو موسڵمانان مەککە بەجێ بهێڵن و بچن بۆ مەدینە، ئەو کات مەدینە ناوی (یەسریب) (یثرب) بوو، لەوێ موسڵمانانی مەدینە چاوەڕێ بوون موسڵمانەکان بچن بۆ لایان تا ڕێزیان بگرن.

موسڵمانەکانی مەککە بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتنە کۆچکردن بۆ مەدینە، ئەوان بە نهێنی و بە دەستە دەستە دەچوون، واتا هەموویان بە یەکجار نەدەچوون، بەڵکو پێنج شەش کەسیان بە شەو پێکەوە بە نهێنی دەچوون.[1]

پرسیار: بۆچی موسڵمانان هەموویان بە یەکەوە نەدەچوون؟

وەڵام: چونکە ئەگەر بێباوەڕەکان بیان زانیایە موسڵمانەکان هەموویان بە یەکەوە کۆچ دەکەن دەچوون بۆیان و لێیان دەدان و دەیانکوشتن.

پرسیار: کام هاوەڵ بوو بەبێ ترسان و بە ئاشکرا کۆچی کرد بۆ مەدینە؟

وەڵام: ئەو هاوەڵە بەڕێزە و پاڵەوانە ناوی عومەری کوڕی خەتاب بوو، ئەو چوو بە ناو بازاڕ و لە ناو خەڵکە بێباوەڕەکەدا هاواری کرد وا من دەچم بۆ مەدینە کێ هەیە بیەوێت منداڵەکانی بێ باوك بن با بێت و ڕێگەم لێ بگرێت منیش دەیکوژم.[2]

پرسیار: هاوەڵەکان بۆچی کۆچیان کرد بۆ مەدینە؟

وەڵام:

١- چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردبوون، پێغەمبەر(ﷺ)یش هەر فەرمانێکی بکردایە موسڵمانەکان یەکسەر جێبەجێیان دەکرد.

---

[1] ـ ابن الاثیر: الكامل في التاريخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە(٦٩٢).
[2] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (١٩٧).

٢- چونکە بێباوەڕەکان لە مەککە زۆر ئازاریان دەدان.

٣- چونکە موسڵمانەکانی مەدینە ئەوانیان زۆر خۆش دەویست و بەڵێنیان دابوو بیانپارێزن.

پرسیار: ئایا موسڵمانەکان منداڵەکانیان دەبرد لەگەڵ خۆیاندا؟

وەڵام: بەڵێ، موسڵمانەکان منداڵەکانی خۆیان دەبرد لەگەڵ خۆیاندا تا لە لای بێباوەڕەکان نەبن، موسڵمانەکان لە ڕێگەدا تووشی جۆرەها ناڕەحەتی و سەختی و برسێتی دەبوون، چونکە ئەوان ڕێگەکەیان دوور بوو، هەروەها ناوچەکە هەمووی بیابان بوو، بیابانیش ئاوی تێدا نیە و ڕەشەبای زۆرە سەختی زۆری لەخۆ گرتووە.

منداڵەکانیان تینوو بوون و ئاو نەبوو بیخۆن، دەیان وت: بابە گیان، دایە گیان بۆچی دەچین بۆ ئەوێ؟ ئەوانیش دەیان وت: ڕۆڵەگیان لە ماڵی خۆمان بێباوەڕەکان ناهێڵن بژین و ئازارمان دەدەن، بۆیە دەچین بۆ مەدینە تا کەس ئازارمان نەدات.

بێباوەڕەکان بەوەش وازیان نەهێنا، کە لە ماڵی خۆیان دەریان دەکردن، بەڵکو ڕێگەیان پێ دەگرتن نەیان دەهێشت بەخواستی خۆیان بچن، ئەوان منداڵەکانیان دەسەند لە دایك و باوکیان یان پارەیان لێ دەسەندن یان ئاژەڵەکانیان دەبردن، ئەو کات دەیان وت دەی ئێستا بڕۆن.

نموونە/ ژنێك هەبوو ناوی دایکی سەلەمە بوو، ئەم ژنە مێردەکەی ناوی باوکی سەلەمە بوو و منداڵێکیان هەبوو، ئەم دایك و باوك و منداڵە هەموویان موسڵمان بوون، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون بڕۆن بۆ مەدینە با لێرە بێباوەڕ و کەسە خراپەکان ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجەتان نەدەن، ئەوانیش کەوتنە ڕێ تا بچن، بەڵام لە ڕێگەدا بێباوەڕەکان ڕێگەیان پێ گرتن و منداڵەکەیان برد و ژنەکەشیان گرت و کردیانە بەندیخانە، ئیتر باوکی هەژاریش خۆی بە تەنها کۆچی کرد و چوو بۆ مەدینە، بەردەوام دایکی بیری دەکردەوە لە منداڵەکەی و بۆی دەگریا، باوکیش بیری دەکردەوە منداڵەکەی و ژنەکەی لە کوێ بن و چیان بەسەر بێت، ئایا بێباوەڕەکان نەیان کوشتوون؟ منداڵەکەش هەمیشە دەگریا بۆ دایك و باوکی و بیری دەکردن، ئەگەر بیوتایە ببەن بۆ لای دایك و باوکم بە توندی لێیان دەدا و دەیان وت

نابێت بچیت، دایك و باوكی تۆ خراپ و شێتن و تۆ دەبێت لای ئێمە بیت، ئەوان تا یەك ساڵی تەواو ژن و منداڵەكەیان بەر نەدا، ئیتر دوایی بەریان دان دایكی سەلەمە كە بەر بوو یەكسەر كەوتەڕێ تا بچێت بۆ مەدینە لە ڕێگەدا پیاوێكی تووش بوو لە بێباوەڕەكان دایكی سەلەمە ترسا كە ڕێگەی پێ بگرێت، بەڵام پیاوەكە كە ناوی عوسمانی كوڕی تەلحە بوو وتی: من وەك ئەوان نیم و نامەوێت تۆ بە تەنها بچیت بەم بیابانە سەختەدا چونكە تۆ ژنیت، من دێم لەگەڵتدا و دەتبەم بۆ ئەوێ، من خۆم موسڵمان نیم،[1] بەڵام ئەمەم پێ باشە ئینجا دایكی سەلەمەش چوو بۆ مەدینە، بەڵام ئەوەندەی نەبرد باوكی سەلەمە مرد و دایكی سەلەمە و منداڵەكەی بە تەنها مانەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چوویە داوای دایكی سەلەمە و بوو بە ژنی پێغەمبەر(ﷺ).[2]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- ئەگەر بێباوەڕان لە خزم و كەس و كار و دایك و باوكمان جیامان بكەنەوە، نابێت ئێمە واز بهێنین لە ئاینەكەمان بەڵكو دەبێت خۆمان ڕابگرین وەك ئەو منداڵە ئازیزەی كە بێباوەڕەكان دووریان خستەوە لە دایك و باوكی خۆی.

٢- بۆمان دەردەكەوێت كە بێباوەڕان چەند پیس و خراپ و ستەمكارن، ئەوان تەنانەت ستەم دەكەن لە منداڵیش، ئەوان ژنیش دەكەنە بەندینخانە.

٣- نابێت بڵێین هەموو بێباوەڕێك خراپ و پیسی تەواوە و هیچ چاكەیەكی نیە، بەڵكو هەیانە چاكەی هەیە و وەك ئەوان خراپ نیە، هەروەك عوسمانی كوڕی تەلحە و ئەبو تالیب و چەندینی تر كە لە مەككەدا بوون.

نموونە/ كوڕێك هەبوو ناوی سوهەیب بوو، ئەم كوڕە بە بچووكی لە جەنگدا گیرا و برا بۆ بازاڕ و فرۆشرا، پیاوێك سوهەیبی كڕی كە ناوی عبداللە كوڕی جودعان بوو، پاشان ئەو پیاوە سوهەیبی ئازاد كرد، دواتر سوهەیب موسڵمان بوو و كەوتە ئیشكردن و پارە و سامانی

[1] د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٢٦).
[2] د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٢٥٣-٢٥٦).

کۆکردەوە بۆ خۆی تا ئەوەی ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە و بگات بە موسڵمانانی تر، بەڵام لە ڕێگەدا بێباوەڕەکان ڕێگەیان پێ گرت و وتیان: ئەی سوهەیب، تۆ منداڵ بوویت هاتیە لای ئێمە، ئێمە تۆمان بە پارە کڕی، دواتر ئازادمان کردی، لە شاری ئێمەدا ئیشت کرد تا پارەت کۆکردەوە و ماڵ و خانووت کڕی و ئاژەڵ و ئەسپ و وشترت کڕی بۆ خۆت، ئێستا دەتەوێت هەموو ئەو شتانە بەریت کە لە لای ئێمە دەستت کەوتووە، یان دەبێت نەچیت یان دەبێت کەل و پەل و پارە و سامان و هەرچیەکت هەیە بیگێڕیتەوە بۆ ئێمە، سوهەیب پێی وتن: ئەگەر هەرچی شتم هەیە بیدەم بە ئێوە ئەو کاتە وازم لێ دەهێنن من بچم بۆ مەدینە ئەم شارە بەجێ بهێڵم بۆ ئێوە؟ ئەوانیشس وتیان بەڵێ هەموو شتەکانت بەجێ بهێڵە بۆ ئێمە و برۆ، سوهەیب هەموو شتەکانی دا بەوان و بە تەنها بەبێ ئەوەی هیچ بەرێت لەگەڵ خۆیدات بەرێکەوت بەرەو مەدینە تا بچێت بۆ لای برا موسڵمانەکانی، چونکە سوهەیب پێی خۆش بوو هیچی نەبێت بەڵام لە ژێر دەستی بێباوەڕەکاندا نەبێت و بەگوێی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بکات کە بریتی بوو لە کۆچکردن بۆ مەدینە.[1]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە پێش موسڵمانەکانەوە نەچوو بۆ مەدینە؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای هەموو موسڵمانەکانەوە چوو بۆ مەدینە بۆ ئەوەی لە پێشدا هەموو موسڵمانەکان لە دەست بێباوەڕەکان ڕزگار بکات، ئەو کاتە کە هەموویان ڕزگاریان بوو و چوون بۆ مەدینە، پێغەمبەریش بچێت بۆ مەدینە.

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- باوەڕ بوون بە خوای گەورە و گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو شتێك گرنگتر و بەسوودترە تەنانەت لە پارە و سامان و ماڵیش، ئەگەر هاتوو وتیان دەبێت پارەکەت ببیت یان دەبێت بێباوەڕ بیت تۆ چی دەکەیت؟

[1]. ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە( ٢٨٢).

سوهەیب کاتێك ئەوەیان پێ وت وتی ماڵ و سامان و هەموو شتێکم بۆ ئێوە بەڵام ئیمانەکەم بۆ خۆم دەبێت.

٢- خوای گەورە هەرگیز کەسانی وا لەبیر ناکات و خۆشی دەوێن و پاداشتیان دەداتەوە.

٣- دەبێت ئێمەیش وەك پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوە خەم و خەفەتی موسڵمانان بخۆین نەوەك خۆمان بیر بکەینەوە لە خۆمان و لە پێشەوە ڕابکەین بۆی دەبێت لە پێش خۆمانەوە موسڵمانانمان لەبیر بێت.

دوای ئەوە موسڵمانان چوون بۆ مەدینە، موسڵمانەکانی مەدینە زۆر چاك بوون لەگەڵ کۆچکەرە موسڵمانەکاندا، ئەوان هەر یەکێکیان و دەستی یەك دوو موسڵمانی کۆچکەری دەگرت و دەیبردەوە بۆ ماڵی خۆیان، و ڕێزی زۆری دەگرتن، ئەوان نانی ماڵی خۆیان دەکرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیان دەدا بە موسڵمانە کۆچکەرەکان و بەشێکیان دەهێشتەوە بۆ خۆیان، ژوور و ماڵەکانیان دەبەش دەکردن نیوەیان دەدا بەوان و نیوەکەی تریشی بۆ خۆیان، باخ و بێستانیان دەکرد بە دوو بەشەوە نیوەی بۆ ئەوان و نیوەی بۆ خۆیان.

تەنانەت ئەگەر پیاوێك دوو ژنی هەبووایە ژنێکیانی تەڵاق دەدا و دەیدا بە برا موسڵمانە کۆچکردووەکەی، بەڕاستی بە تەواوەتی ڕێزیان دەگرتن بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) یش زۆر موسڵمانەکانی مەدینەی خۆش دەویست و دوعای خێری بۆ دەکردن و دەیوت من لەگەڵ ئەوان دام.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

١- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا کۆچ بکات؟

٢- موسڵمانەکان بۆچی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە و نەچوون بۆ شوێنێکی تر؟

٣- عومەری کوڕی خەتاب کێ بوو؟ چۆن موسڵمان بوو؟

٤- قورەیش چیان کرد لە بەرامبەر موسڵمانەکانی حەبەشە؟

٥- نەجاشی کێ بوو؟ بۆچی بە ئاشکرا نەیوت من موسڵمان بووم؟

٦- ئەبو تالیب چۆن مرد؟ پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی خەفەتی بۆ خوارد؟

٧- چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگرین لە مردنی ئەبو تالیبدا؟

٨- پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی چوو بۆ تائیف؟ لەوێ چی بەسەر هات؟

٩- پێغەمبەر(ﷺ) کەی جنۆکەکانی بینی و چی وت لەگەڵیاندا؟

١٠- ڕووداوی ئیسرا و میعراج واتای چیە؟

١١- قودس کوێیە؟ بۆچی لە لای موسڵمانان پیرۆزە؟

١٢- پەند و ئامۆژگاری چی وەردەگرین لە ڕووداوی ئیسرا و میعراج؟

١٣- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای هۆزەکان؟ بێباوەڕەکان چیان کرد؟

١٤- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك چوو بۆ لای هۆزەکان بە تەنها نەچوو؟

١٥- خەڵکی مەدینە چۆن موسڵمان بوون؟ چ پەیمانێکیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)؟

١٦- بۆچی هاوەڵەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە؟

١٧- بێباوەڕەکان چیان دەکرد لەگەڵ موسڵمانە کۆکچکەرەکاندا؟

١٨- بۆچی موسڵمانەکان هەموویان بە یەکەوە نەچوون بۆ مەدینە؟

١٩- چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگرین لە ڕووداوەکەی سوهەیبدا؟

٢٠- بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای هەموویانەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە؟

٢١- موسڵمانەکانی مەدینە چۆن بوون لەگەڵ موسڵمانە کۆچ کەرەکاندا؟

# بەشی پێنجەم

## کۆچکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە

پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنی دابوو بە موسڵمانان کە لە دواییدا خۆشی کۆچ دەکات بۆ مەدینە چونکە ئەو خۆی ویستی خۆی تاکە کەس بێت کە کۆچ دەکات کاتێك ئەو پێغەمبەرە ئازیزە کۆچی کرد بۆ مەدینە ناوچە بە شێوەیەکی تایبەت و جیهانیش بە شێوەیەکی گۆڕانی بەسەرداهات، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ چەند کارێکی گرنگی کردو، دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراند.[1]

## پلانی بێ باوەڕان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ):

بێ باوەڕان دوای ئەوەی بینیان موسڵمانەکان ناوچەکانی مەککەیان بەجێ هێشتووە و ڕزگاریان بووە لە دەستی بێ باوەڕان، هەروەها کە زانیان پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت کۆچ بکات، بڕیارياندا پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن، بەڵام هیچکام لەوانە نەیوێرا ئەو ئیشە بکات، چونکە دەیان وت دوای هۆزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆڵەمان لێ دەسەننەوە، بۆیە ئەمجارە هەموویان بە یەکەوە بڕیارێکی تازەیان دا کە هەموویان ئامادە بوون جێبەجێی بکەن.[2]

پرسیار: ئەو بڕیارە چی بوو کە هەموویان دایان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)؟

وەڵام: بێباوەڕان بڕیاریاندا لە هەموو هۆزێکدا گەنجێکی ئازا بهێنن و هەموویان کۆبکەنەوە و هەموویان بە یەکجار پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن ئیتر بەمە دیار نیە کێ کوشتوویەتی، هۆزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ناتوانن تۆڵە بسێننەوە، خوای گەورە هەواڵی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بێباوەڕان دەیانەوێت بیکوژن، بۆیە فەرمانی پێکرد تا کۆچ بکات بۆ مەدینە.[3]

---

[1] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)، لاپەڕە (١١٦).
[2] ـ حبیب محمد سعید: ژیانی نازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٤٣٣).
[3] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، لاپەڕە (٢٠٢).

بێباوەڕان سەرقاڵی خۆ ئامادەکردن بوون و خۆشیان بوو وایان دەزانی پێغەمبەر(ﷺ) پێی نەزانیون، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵی خۆ ئامادەکردن بوو تا کۆچ بکات بۆ مەدینە، شارە خۆشەویستەکەی خۆی بەجێ هێشت، هەرچەندە مەککەی خۆش دەویست بەلام ناچار بوو بڕوات، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك دەیویست بڕوات، سەیری مەککەی کرد و دەیفەرموو ئەی شارەکەم سوێند بە خوا گەر بە زۆر دەریان نەکردمایە بەجێم نەدەهێشتی.[1]

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو طالیبی لە شوێنی خۆی دانا و پێی فەرموو لە شوێنەکەی مندا بخەوە وە تۆ دوایی وەرە.[2]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی عەلی نەبرد لەگەڵ خۆیدا؟

وەلام: چونکە هەندێ ئەمانەت و ڕاسپاردەی هەبوو کە بێباوەڕان دایان نابوو لە لای پێغەمبەر (ﷺ) دەبوایە ئیمامی عەلی بیانداتەوە دەستیان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) تەواو دەست پاك و ئەمانەت پارێز بوو.[3]

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) چوو بە شوێن ئیمامی ئەبو بوکردا پێی فەرموو کە خۆی ئامادە بکات تا کۆچ بکەین بۆ مەدینە و ئەبو بەکریش زۆر زۆر پێی خۆش بوو دوو حوشتری ئامادەکردبوو تا هەر کات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کۆچ بکات.[4]

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەبێت پارەی یەکێك لەو دوو حوشترەم لێ وەربگریت ئەگەرنا من نامەوێت، چونکە دەمەوێت بە پارەی خۆم وشترەکە بکرم، ئەبو بەکریش ڕازی بوو و هەردووکیان کەوتنە توند و تۆڵ کردنی ئاژەڵەکانیان، دوایی بە نهێنی و لە تاریکی شەودا کەوتنەڕێ،[5] تا هیچ کەس پێیان نەزانێت، بێباوەڕەکان کاتێك چوونە لای ماڵەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و چوونە ژوورەوە ویستیان بە شمشێر یەکسەر بدەن لە سەری ئەو کەسەی لە جێگەکەدا

[1] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٧١).
[2] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٧).
[3] ـ د. حامد محمد الطاهر: حیاة الصحابة للاطفال، لاپەڕە (٨٧).
[4] ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤١٧).
[5] ـ حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٤٣٥).

خەوتووە، کە ئیمامی عەلی بوو، ئەوان وایان دەزانی کە پێغەمبەر(ﷺ)ە، بەڵام کاتێک سەریان بەرز کردەوە بینیان کە عەلی کوڕی ئەبو تالیبە،[1] بۆیە بڕیاریاندا نەیکوژن زانیان کە پێغەمبەر(ﷺ) چووە بۆ کۆچکردن و وتیان دەبێت بکەوینە شوێنی تا بیدۆزینەوە و بیکوژین، پێغەمبەر(ﷺ)و ئیمامی ئەبو بەکر بەردەوام دەچوون، کابرایەکیش کە شوان بوو دەچوو بە شوێن پێی وشترەکانیاندا بۆ ئەوەی شوێن پێیەکەیان دیار نەبێت و بێباوەڕان پێیان نەزانن.[2]

ئەبو بەکریش هەر جارە و لە لایەکەوە بوو جارێ لە لای ڕاست و جارێ لە لای چەپەوە جارێ لە پێشەوە و جارێ لە دواوە، چونکە دەیوت ئەگەر لە هەر لایەکەوە تیریان وەشاند بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یان هێرشیان کردە سەر با بەر من بکەوێت و من بکوژرێم باشترە نەوەک پێغەمبەر(ﷺ)، واتا ئەبو بەکر پێغەمبەر(ﷺ)ی لە خۆی زیاتر خۆش دەویست.[3]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- بێباوەڕان هێندە خراپ و ستەمکارن نایەڵن موسڵمانان یان مرۆڤی هەژار و بێ تاوان لە ماڵی خۆیشیدا دانیشێت، هەروەها ناهێڵن لە وڵاتی خۆیشیدا بچێتە دەرەوە، بەڵکو دەیانەوێت بیکوژن و هەر پلانێکی بۆ دادەنێن تا بیکوژن.

٢- بێباوەڕەکان نەفام و بێ عەقڵ بوون وایان دەزانی هیچ کەس نیە پێیان بزانێت بەڵام خوای گەورە پێی زانین و کارەکەی ئاشکرا کردن، هەواڵی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە دەیانەوێت تۆ بکوژن، بۆیە کۆچ بکە بۆ مەدینە.

٣- دەبینین کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندە ئەمانەت پارێز بووە، ئەو کەسانەی دوژمنی بوون و دەیانویست بیکوژن ئەمانەتەکانی خۆیان دەدایە لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەیانوت هەڵی گرە بۆمان، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک ویستی کۆچ بکات عەلی کوڕی ئەبو تالیبی دانا تا ئەمانەتەکانیان پێ بداتەوە، خۆ ئەوە ئەگەر کەسێکی تر بوایە دەیبردن بۆ خۆی و دەیوت

[1] ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٠٤).
[2] ـ د. حسن ابراهیم حسن: تأریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٨٤).
[3] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)، لاپەڕە (١١٩).

ئەوان هاتوون من بکوژن، ئەی چۆن من ئەمانەتەکەیان بدەمەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی دانەوە.

٤- پێویستە ئێمە شار و وڵاتی خۆمان زۆر خۆش بوێت و هەمیشە حەز بکەین لەوێدا بژین و ئاوەدانی بکەینەوە بەڵام ئەگەر ناچار بووین بەجێی بهێڵین، ئەوا دەبێت هەر خۆشمان بوێت و لە بیرمان نەچێت کە ئەوێ نیشتیمانی ئێمەیە وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی خۆش دەویست و بە ناچاری بەجێی هێشت.

٥- منداڵانی ئازیز سەیری ئەم ئازایەتی و مەردایەتیەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بکەن کە چەندە مەردانە لە شوێنەکەی پێغەمبەر (ﷺ) خەوت و بە گوێی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)ی کرد و ترسی نەبوو لەوەی کە بێباوەڕان بیکوژن.

٦- دەبێت ئێمە بە پارەی خۆمان شت بکڕین داوا لە خەڵکی تر نەکەین، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) وشترەکەی بە پارەی خۆی کڕی و نەیهێشت ئەبو بەکر بۆی بکڕێت.

٧- ئەگەر شتێکمان کرد بە نهێنی بیکەین و نەهێڵین خەڵکی پێمان بزانێت، بەڵکو دەبێت تەنها خوای گەورە پێمان بزانێت، پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبو بەکریش بە شەودا چوون بۆ ئەوەی کەس نەزانێت چوون بۆ کوێ.

## * پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر لە ئەشکەوتدا:

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر لە ڕێگەدا بوون بۆ مەدینە، گەیشت بە ئەشکەوتێك بۆیە بڕیارياندا لەوێ بحەسێنەوە و خۆیان بشارنەوە تا ئەگەر بێباوەڕان گەیشت پێیان پێیان نەزانن.[١]

پرسیار: ئەو ئەشکەوتە ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو ئەشکەوتە ناوی(ثور) بوو،[١] ئەوان لەوێ چاوەڕوانی کەسێکیان دەکرد تا خۆراکیان بۆ بهێنێت چونکە برسیان بوو، کاتێك چوونە ژوورەوە کۆترێك هات و لەبەردەم

---

[١]- حبیب محمد سعید: ژیانی ئازیزمان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٤٤١).

ئەشکەوتەکەدا هێلانەیەکی دروست کرد، عەنکەبووتیش هات و تۆڕێکی دروستکرد لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا تا بێباوەڕان وا بزانن کەس نەچووەتە ئەم ئەشکەوتە،[٢] کاتێك بێباوەڕەکان گەیشتنە لای ئەشکەوتەکە سەیریان کرد ویستیان بچنە ناوی تا بزانن پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدایە بەلآم یەکێکیان وتی کەس نەچووەتە ناو ئەمە چونکە ئەگەر کەس بچوایەتە ناوی ئەوا ئەم تۆڕ و هێلانەیە تێك دەچوون، بۆیە پێویست ناکات بچینە ناوی با بکەینە شوێنیان،[٣] کاتێك ئەبو بەکر ئەوانی دەبینی ترس دایگرتبوو دەترسا بێنە ژوورەوە و پێیان بزانن بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو مەترسە ئێمە خوامان لەگەڵدایە، دوایی بێباوەڕان چوون و ئەشکەوتەکەیان بەجێهێشت و خوای گەورەش هەردووکیانی پاراست فێری کردن کە با لەمەودا نەترسن.[٤]

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر لەوێ چاوەڕێی کێیان دەکرد؟

وەلآم: لەوێ چاوەڕێی پیاوێکیان دەکرد ناوی (عبداللە کوڕی ئورەیقن) بوو.[٥]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) و خوای گەورە هەر فەرمانێکمان پێ بکەن ئێمە یەکسەر بیکەین چونکە بەرژەوەندی خۆمانی تێدایە، خوای گەورە چاکە و بەرژەوەندی ئێمەی دەوێت.

٢- نابێت ئێمە بترسین، چونکە ئێمە موسڵمانین و خوای گەورەمان خۆش دەوێت و خوای گەورەش ئێمەی خۆش دەوێت و ئاگای لێمانە و دەمانپارێزێت: دەی ئەگەر خوای گەورە بمانپارێزێت ئیتر بۆچی هەر لە خۆمانەوە بترسین.

---

[١] ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤١٨).

[٢] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)، لاپەڕە (١٢٠).

[٣] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، لاپەڕە (٢٠٤).

[٤] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٧٢).

[٥] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٧٠).

## * دایکە مەعبەد:

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبکر و عبداللە کوڕی ئەرەیقندا بەرێ کەوتن بەرەو مەدینە لە ڕێگادا پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت بە ژنێك کە ناوی دایکی مەعبەد بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) مەڕێکی بینی لای ئەو ژنە بە ژنەکەی فەرموو: دایکە مەعبەد بۆچی ئەو مەڕە لەوێدایە؟ دایکی مەعبەد وتی: ئەو مەڕە زۆر لاوازە و ناتوانێت بچێت بەڕێگەدا، بۆیە پیاوەکەم نەیبردووە بۆ لەوەڕ.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شیری هەیە؟ وتی: نا، زۆر لاوازە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مۆڵەتم پێ دەدەی کە من بیدۆشم، دایك و باوکم بە قوربانت بێت، ئەگەر دەزانی شیری هەیە بیدۆشم، پێغەمبەر(ﷺ)یش دۆشی و (بسم الله الرحمن الرحیم)ی کرد و دوعای کرد و شیرێکی زۆری لێ پەیدابوو، پاشان دوو هاوڕێکەی تریشی تێریان لێ خواردەوە، پاشان قاپەکەی پڕکردەوە بۆ ژنەکەش پاشان پارەیان پێدا و ماڵ ئاواییان لێ کرد.

کاتێك مێردەکەی هاتەوە سەری سوڕما کە ئەو شیرە چیە لە ماڵیاندا: بۆیە وتی ژنەکە ئەو شیرە چیە لە ماڵماندا خۆ من لە ماڵەوە مەڕەکانم بەجێ نەهێشتووە، جگە لەوەیان کە هیچ شیری نیە، ئیتر ئەم شیرەت لە کوێ بوو؟ دایکی مەعبەد وتی نە بە خوا نەمهێنا، بەڵام پیاوێکی پیرۆز و بە بەرەکەت دای بە پاڵ ماڵماندا و ئەم مەڕەی دۆشی و شیری لێ هات، پیاوەکە وتی دایکی مەعبەد ئەو پیاوە شێوە و ڕوخساری چۆن بوو؟ دایکی مەعبەد کەوتە وەسفکردنی شێوە و ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ)، باوکی مەعبەد (واتا پیاوەکە) وتی سوێند بە خوا ئەوە ئەو پیاوەیە کە لە مەککە دەرکەوتووە باسی دەکەن، خۆزگە دەبووم هاوڕێکەی.[١]

[١]. ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢١٤).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- کاتێك دەمانەوێت ئیش یان شتێك بکەین کە خاوەنی هەبێت دەبێت مۆڵەتی لێ وەربگرین و بڵێین مۆڵەت هەیە ئەوە بکەین؟ ئەگەر وتی بەڵێ ئەو کات دەستکاری دەکەین و ئەگەر وتی مۆڵەت نیە نابێت دڵمان بڕەنجێت نابێت بیکەینە دڵ ئێشەی نێوانمان.

٢- دەبێت باوەڕمان هەبێت بە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

## * سوراقە دەیەوێت پێغەمبەر (ﷺ) بکوژێت:

بێباوەڕەکانی مەککە بە ناو خەڵکدا بانگەوازیان دەکرد هەر کەسێك پێغەمبەرمان بۆ بهێنێت بە زیندوویی بێت یان بە کوژراوی ئەوا سەد وشتری پێ دەدەین، سەد وشتریش زۆر گران بوو و هەر کەس هەیبوایە دەوڵەمەندێکی گەورە بوو ئەم قسە و باسە بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بوویەوە و خەڵکێکی زۆر بەمەی زانی یەکێ لەو کەسانەی ئەمەی بیست ناوی سوراقە بوو کە پیاوێکی جەنگاوەری ئازا بوو ئەو دڵی چووبوویە سەر ئەو خەڵاتە گەورەیە بڕیاریدا پێغەمبەر(ﷺ) بگرێت، سوراقە دەڵێت من کاتێك ئەو هەواڵەم بیست پیاوێك هات بۆ لام وتی سوراقە من لە کەناری دەریاوە ڕەشاییەکم بینی کە پێ دەچێت پێغەمبەر و هاوڕێکەی بێت منیش زانیم ئەوانن بەڵام خۆم بێ ئاگا کرد و وتم ئەوان نین.

پرسیار: بۆچی سوراقە وتی ئەوان نین کەچی دەیزانی ئەوانن؟

وەڵام: چونکە سوراقە ویستی خۆی بچێت بە شوێنیاندا و بیانگرێت، سوراقە دەڵێت پاشان دوای ماوەیەك لە ناو خەڵکیدا هەستام و چووم بۆ ماڵەوە سواری ئەسپەکەم بووم کەوتمە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام کاتێك سوراقە کەوتە شوێنیان ئەسپەکەی چەقی بە زەویدا و نەیتوانی بڕوات دوایی هەستایەوە و هەمتر وای لێ هاتەوە و تا سێ جار ئەو کات بڕیاریدا واز بهێنێت و بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت: بێباوەڕان خەڵاتیان داناوە بۆ هەر کەسێك کە تۆ بگرێت یان تۆ بکوژێت سەد وشتری بکەنە خەڵات و دیاری پاشان وتم چیتان دەوێت با بتان دەمێ بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هیچی لێ نەویست و تەنها فەرمووی لای کەس باسمان مەکە کە ئێمە لە کوێین با خەڵك پێمان نەزانێت، سوراقە پاش ئەوەی کە زانی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە

مەدینــە کەوتــە باســکردنی ئــەم ڕووداوە و خــەریك بــوو خــەڵکێکی زۆر بــەم ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەوە موسڵمان بن.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت هەمیشە لە بیرمان بێت خوای گەورە ئاگاداری ئێمەیە ئەگەر ئێمە گوێڕایەڵی خوا بکەین خوای گەورە دەمانپارێزێت و سەرمان دەخات.

٢- بێباوەڕان وا دەزانن دەتوانن ڕێگە بگرن لە ئیشی خوای گەورە بەڵام ئەوان نـەفامن و هیچ کات ناتوانن ئیشی خوای گەورە تێك بدەن.

## * هەندێ ڕووداوی تر لە کۆچکردنەکەدا:

لەو کۆچکردنەی پێغەمبەر(ﷺ) چەند ڕووداوێکی تر ڕوویدا کە ئەمانە هەندێکیانن:

١- دوو کەس دز بوون کە هەمیشە ڕێگەیان دەکـرت بـە خـەڵك و دزیـان لێ دەکـردن و گاڵتەیان پێ دەکردن، ئەمانە بە سەرشـۆڕکەران ناسـرابوون کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) هـەواڵی ئەوانی بیست، چوو بۆ لایان و فەرمووی موسـڵمان ببـنن ئـەوانیش ڕازی بـوون و موسـڵمان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ناوتان چیە؟ وتیان ناومان سەرشۆڕکەرانە، فـەرمووی نـەخێر ناوی ئێوە ڕێزگرانە، بەمە ئەوانیش وازیان هێنا لە دزی کردن و چوون بۆ مەدینە.[2]

٢- زوبەیری کوڕی عەوام کە بازرگـان بـوو و لـە نـاو کـاروانێکی بازرگـانی هاتنـەوە، جلوبەرگێکی جوانی سپی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و یەکێکیش بە ئەبو بەکر هەروەها یـەکێکی تر لەو کەسانە کە ناوی تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا بوو گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر، ئەو لە کاروانی بازرگانیدا گەڕابوویەوە و هەندێ جل و بەرگی پێشکەش کردن.[3]

---

[1]. ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٢٠-٤٢٢).

[2]. د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٨٧).

[3]. د. حامد محمد الطاهر: حیاة الصحابة للاطفال، لاپەڕە (١٢٢).

٣- پێغەمبەر(ﷺ)یش کاتێك چوو بەرەو مەدینە لە ڕێگەدا گەیشت بە کەسێك کە ناوی بورەیدە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو بورەیدە موسڵمان ببە دواتر بورەیدە بوو بە یەکێك لە موسڵمانە زیرەك و ئازاکانی ناو موسڵمانان.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- ئێمە دەبێت قسەی چاك و خێر و ئامۆژگاریمان هەبێت بۆ هەموو کەسێك، نابێت بڵێین ئەمە دزە و ئەوە خراپە و ئەوە چیە، بەڵکو دەبێت قسەیان بۆ بکەین بەڵکو خوای گەورە بە هۆی ئێمەوە ڕێگەیان نیشان بدات و موسڵمان بن.

٢- دەبێت ناوی ناشیرین نەنێین لە کەس و هەر کەس ناوەکەی خراپ و ناشرین بوو، دەبێت ناوەکەی بگۆڕین و ناوێکی خۆش و جوانی لێ بنێین.

٣- ئەگەر جل و بەرگ یان هەر شتێکی ترمان هەبوو کە باش بێت دەبێت چەندە دەتوانین پێشکەشی بکەین بە موسڵمانان و مامۆستا ئاینی و چاکەکارەکان.

## * موسڵمانانی مەدینە پێشوازی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن:

موسڵمانانی مەدینە هەر لەو کاتەوەی لە بەڵێنی یەکەمی عەقەبەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا دانیشتن و قسەیان کرد و باوەڕیان هێنا، هەمیشە تامەزرۆی دیداری پێغەمبەر(ﷺ) بوون و حەزیان دەکرد بە شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا بن ئەوان کەوتنە خزمەتکردنی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و گوێیان دەگرت لە فەرمان و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ).[2]

کاتێك موسڵمانانی مەدینە بیستیان کە پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەککەوە دەرچووە بۆ مەدینە و دەیەوێت بچێت لەناو ئەواندا بژیت و بانگەوازیان ئەمان لە خۆشیان نەیاندەزانی چی بکەن هەموویان دەقیقە سەعاتیان دەژمارد تا پێغەمبەر(ﷺ) بگاتە لایان هەموو ڕۆژێك لە بەیانیەوە تا ئێوارە چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و لە بەرزاییەکانەوە و لەسەر

---

[1] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٢٨٦).
[2] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، لاپەڕە (٢٠٩).

درەختە بەرزەکانەوە سەیریان دەکرد بزانن پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکری صدیق نەهاتن، لە شەویشدا خەو نەدەچووە چاویان تامەزرۆبوون تا پێغەمبەر(ﷺ) بگاتە لایان، بیریان دەکردەوە دەبێت ئێستا پێغەمبەری ئازیز لە کوێ بێت و چی بکات دەبێت چەندە ماندوو و برسی بێت؟ کەی دەگاتە ئێرە؟ کێی لەگەڵدایە؟

بەڵێ ئازیزان ئەوان بەردەوام پرسیاری زۆر دەهات بە مێشکیاندا هەردەم چاوەڕێی ئەو مژدە خۆشە بوون کە بڵێن پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەدینە کاتێك منداڵێك باوکی خۆی بۆ ماوەیەکی زۆر زۆر نابینێت زۆر بیری باوکی دەکات و حەز دەکات بیبینێت کاتێك باوکی هەواڵ دەنێرێت کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لای منداڵە ئازیزەکەی ئیتر ئەو منداڵە لە خۆشیدا نازانێت چی بکات و خەوی لێ ناکەوێت، هەمیشە چاوەڕێی گەیشتنی باوکیەتی.

خەڵکی مەدینەیش زیاتر لە شەیدایی یان بۆ بینینی باوك و دایك و خۆشك و برا تامەزرۆی بینینی پێغەمبەری خۆشەویست محمد(ﷺ) بوون.

ڕۆژێکیان کاتێ چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەکرد ئەوانەی لە بەرزاییەوە سەیریان دەکرد و چاوەڕێ بوون مژدە بدەن بەوانی تر.[١]

بینیان لە دوورەوە کەسانێك لەسەر وشترەوە دیارن، کاتێك نزیکتر بوونەوە، زانیان کە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکری صدیقن زانی ئەو ئازیز و خۆشەویستەمان بەرەو مەدینە دێت، خەریکە دەگات بۆیە بە دەنگی بەرز و بەوپەڕی خۆشیەوە هاواریان دەکرد ئەوەتا پێغەمبەری ئازیزمان هات، موسڵمانان سەیرکەن وا پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر گەیشتن، ئیتر موسڵمانان لە خۆشیدا نەیاندەزانی چی بکەن، هەموویان بەپەلە چوون بەرەو ڕووی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر و خۆی دەگەیاند پێیان.

منداڵ و گەورە و ژن و پیاو و پیر و هەموویان بە یەکەوە دەچوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دەفیان لێ دەدا و سروودیان دەوت.

---

[١] ـ عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)، لاپەڕە (١٢٤).

کاتێك گەیشتن بە یەکتر سەلامیان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر و ئەوانیش سەلامیان لێ کردن و سوپاسی ئەو هەڵوێستە جوانەیان کردن.

موسڵمانەکانی مەدینە هەریەکیان دەیوت دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی ئێمەدا بێت و لە لای ئێمە ئیسراحەت بکات ئیتر خەریك بوو بیکەن بە جەنگ، پێغەمبەر(ﷺ) هەمتر وەك جاران کە ئەو دادوەری کردن و فەرمووی وشترەکەم لای ماڵی کێ وەستا لەوێ دەبم و لەوێ دەحەسێمەوە.[1]

کاتێك وشترەکە کەوتەڕێ هەموویان دوعایان دەکرد خوایە گیان لە لای ماڵی ئێمە رابوەستێت تا پێغەمبەر گیان لە ماڵی ئێمەدا بێت، بەڵام وشترەکە لە لای ماڵی پیاوێك راوەستا کە ناوی (ئەبو ئەیوب) باوکی ئەیوب بوو، ئەو کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ ماڵی ئەوان خانووەکەیان دووقات بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لە قاتی خوارەوەدا بوو، باوکی ئەیوب و ژنەکەیشی لە قاتی سەرەوەدا بوون، کاتێك باوکی ئەیوب سەیری کرد سەربانەکە دڵۆپە دەکات ترسا پێغەمبەر(ﷺ) لە خەو هەستێت بۆیە یەکسەر بە جل و بەرگەکەی خۆی ئاوەکەی لابرد و نەیهێشت دڵۆپە بکات،[2] بەڵێ ئەوەیە خۆشەویستی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بەم جۆرە پێغەمبەر(ﷺ)لە مەککەوە هاتە مەدینە و لەوێدا مایەوە تا ماوەیەکی زۆر کە(١٠) ساڵ بوو دوایی گەڕایەوە بۆ ئازادکردنی مەککە.

---

[1] ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەرە (٤٢٦).

[2] ـ خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، لاپەرە (١٤٩-١٥٤).

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

١- پێغەمبەر(ﷺ) کەی بڕیاریدا بچێت بۆ مەدینە؟ کێی لەگەڵ خۆیدا برد؟

٢- بێباوەڕەکان چ پلانێکیان دانا بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)؟

٣- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نەبرد لەگەڵ خۆیدا؟

٤- بۆچی ئەبو بەکر شوێنی خۆی دەگۆڕی بۆ ڕاست و چەپ و پێش و دواوە؟

٥- ناوی ئەو ئەشکەوتە چی بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر چوونە ناوی؟

٦- بۆچی بێباوەڕەکان نەچوونە ناو ئەشکەوتی (ثور)؟

٧- ئەبو بەکر بۆچی لە ئەشکەوتەکەدا دەترسا؟ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموو؟

٨- دایکی مەعبەد کێ بوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) چوو، چی کرد بۆی ؟

٩- سوراقە بۆچی بە پیاوەکەی وت ئەوان پێغەمبەر و ئەبو بەکر نەبوون؟

١٠- سوراقە بۆچی کەوتە شوێن پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر؟

١١- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دوو دزەکەی بینی چی کرد؟

١٢- (زوبەیر و طلحة) کێ بوون؟ چیان پێشکەش کرد بە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر؟

١٣- موسڵمانەکانی مەدینە چۆن خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی پێغەمبەر(ﷺ)؟

١٤- پێغەمبەر(ﷺ) چۆن چارەسەری ناکۆکی هاوەڵەکانی کرد، کە لە ماڵی کامیان بێت؟

١٥-ئەبو ئەیووب کێ بوو؟ چۆن پێشوازی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)؟

## بەشی شەشەم

## کارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینەدا:

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مەدینە، لەوێ چەند کارێکی گرنگی کرد تا ئەمڕۆش کاریگەری باشی هەیە لەسەر ژیان و هەڵسوکەوتی موسڵمانان، لەوانە:

**١) دروستکردنی مزگەوت:**

یەکەم ئیش کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامی دا ئەوە بوو کە لە مەدینەدا مزگەوتێکی دروست کرد تا ببێتە شوێنی نوێژکردن و کۆبوونەوە و بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا وشترەکەی لە کوێ دابنیشێت، لەوێدا مزگەوتەکە دروست بکات،[1] وشترەکەیش لە شوێنێکدا وەستا دارخورمای تێدابوو و ئەو شوێنە هی دوو منداڵی هەتیو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) منداڵەکانی بانگ کرد و بڕیاریدا ئەو شوێنەیان لێ بکڕێت، هەرچەندە منداڵەکان وتیان نایفرۆشین و بە خەڵات دەیبەخشین، پێغەمبەر(ﷺ) بەمە ڕازی نەوبوو و فەرمووی بە کڕین بێ و پارەی پێدان.[2]

پاشان هەموویان دەستیان کرد بە دروستکردنی مزگەوتەکە و پێغەمبەریش(ﷺ) یارمەتی دەدان لە دروست کردنیدا و خشتی بە دەستە پیرۆزەکانی خۆی هەڵدەگرت.[3]

## ـ مزگەوتەکە چەند شوێنێکی تێدابوو کە ئەمانە بوون:

١- شوێنێك هەبوو کە تیایدا هەر کەس و بڕێك خورمایان بە خۆڕایی دادەنا بۆ ئەو کەسانەی کە هەمیشە سەرقاڵی پەرستش و زانست و جیهاد بوون، ئەو کەسانە پێیان دەوترا(سوففە)،[4] ئەبو هورەیرە کە فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە یەکێکە لەو کەسانە.[5]

---

[1] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢١١).
[2] ـ د. علی محمد محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٠٠).
[3] ـ محمد ملا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٣١٦).
[4] ـ د. علی محمد محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٠٢).
[5] ـ د. علی محمد محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٠٣).

پرسیار: ئایا دەکرێت ئێمەش بچینە مزگەوت و ئیش نەکەین و هەمیشە لەوێ بین؟

وەڵام: نەخێر ناکرێت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون کە نابێت کەنار بگرین و دەبێت ئیش بکەین، بەڵام ئەو کەسانەی زۆر دەچوونە بازاڕیش و زانست فێر دەبوون و دەچوون بۆ جیهاد و بەو شێوەیە کەنار بگرن.

٢- ژوورەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە دەوری مزگەوتەکەدا بوون، پێغەمبەر(ﷺ) ماڵی لەو دەوروبەرەدا بوو تا نزیك بێت لە مزگەوت، بەڵام ژوور و خانووەکانی پێغەمبەر(ﷺ) گەورە و زانراو نەبوون، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەیەکی سادە و ساکار خانووەکانی خۆی دروست دەکردن، نەوەك هاوەڵەکانی تری وابێت.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- مزگەوت گرنگترین شتە کە دەبێت لە شار یان لە لادێ یان شوێنێکدا هەبێت چونکە مزگەوت ئەم سوودانەی هەیە بۆ موسڵمانان:

أ- موسڵمانان لەوێدا بەیەکەوە نوێژ دەکەن و پاداشتی نوێژەکەیان ٢٤ جار زیاترە لەوەی کە بە تەنها بیکەن.

ب- موسڵمانان هەر گرفت و کێشەیەکیان هەبێت ئەوا دەچن بۆ مزگەوت و لەوێ هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن چونکە مزگەوت پیرۆزترین شوێنە.

ج- موسڵمانان هەموویان لەوێ پێکەوە کۆدەبنەوە قسە و گفت و گۆ دەکەن و یەکتر دەبینن خۆشەویستیان بۆ یەکتر زیاتر و چاك یەکتر دەناسن.

٢- دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە جوانی وەکو جاران دەبێتە دادوەری ئیشەکە.

٣- دەبێت ئێمەی منداڵ ئەرکی گرنگ لە خۆ بگرین و هەوڵ بدەین بە مەردانە بجووڵێینەوە، سەیرکەن ئەو دوو منداڵەی کە شوێنەکە هی ئەوان بوو ویستیان ئەو شوێنە بە

---

[1] د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٠٠-٣٠١).

خەڵات بدەن بە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بەوە ڕازی نەبوو پارەی پێدان لە جیاتی.

٤- دەبێت خۆمان زۆر بپارێزین لە خواردنی ماڵی هەتیو، چونکە هەتیو باوکی نیە و کەسی نیە ئیشی بۆ بکات و پارە و خۆراکی بۆ بهێنێتەوە بەڵام ئەگەر تەنها سەردانیان بکەین جارێك لەوێ بین و شت ببەین لەگەڵ خۆماندا ئەوا قەیناکان و دەتوانین لە لای ئەو هەتیوە بین تا دڵی خۆش بکەین، پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە نەبوو زەوی ئەو دوو هەتیوە ببات و پارەیان نەداتێ بەڵکو فەرمووی ئەگەر پارە وەرنەگرن زەویەکەمان ناوێت لێتان.

٥- ئەگەر بینیمان کەسانێك هەن و هەوڵی فێربوونی زانست دەدەن، دەبێت هەرچۆنێك پێمان دەکرێت یارمەتیان بدەین، چونکە کەسی زانستخواز خوای گەورە و فریشتەکان ڕێزی لێ دەگرن و دەبێت ئێمەش ڕێزی لێ بگرین.

٦- پێویستە هەوڵ بدەین نزیك مزگەوت بین تا بتوانین هەمیشە بچین بۆ مزگەوت و لەوێ لە خۆشیدا بین و پەرستشی خوای گەورە بکەین.

## ٢) بانگدان لە مزگەوتدا:

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا کەوتە ڕاوێژ و گفتوگۆکردن لەسەر ئەوەی چۆن خەڵك ئاگادار بکەنەوە کاتی نوێژ هاتووە، چونکە ئەو کات هێشتا بانگ نەبوو، بۆیە دەبوایە بریان بکردایەتەوە کە چۆن بە خەڵك بڵێن، هەندێك وتیان وەك جوولەکە بکەین، هەندێك وتیان وەك مەسیحیەکان بکەین ئیتر هەر یەکێکیان شتێکی دەوت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕای هیچ کامیانی وەرنەگرت.[1]

یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی عبداللە کوڕی زەید بوو، خەریك بوو خەوی لێ بکەوێت کەسێك هەندێ شتی فێرکرد کە بەو شێوازە خەڵك ئاگادار بکەنەوە.[2]

پرسیار: ئەو شێوازە چی بوو کە فێرکرا؟

---

[1] محمد ملا فائق: ژیانی پێغەمبەری خوا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٣٢٥).
[2] د. وهبة الزحیلي: الفقه الاسلامی وادلته، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٦٩٢).

وەڵام: ئەم شێوازەی بانگدانە بوو کە ئەمڕۆ ئێمە دەیڵێین و بەم شێوەیە بوو:

الله اكبر الله اكبر

الله اكبر الله اكبر

اشهد ان لا اله الا الله

اشهد ان لا اله الا الله

اشهد ان محمدا رسول الله

اشهد ان محمدا رسول الله

حي على الصلاة

حي على الصلاة

حي على الفلاح

حي على الفلاح

الله اكبر الله اكبر

لا اله الا الله

پاشان عبدالله ئەمەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتابیش هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی منیش وەك عبدالله ئەو خەوەم بینی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا بەو شێوەیە بانگ بدرێت بە بیلالی فەرموو بڕۆ بانگ بدە.[1]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بە بیلالی فەرموو؟

وەڵام: چونکە بیلال دەنگی خۆش بوو.

---

[1]. ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٣٦).

## ٣) برایەتی نێوان ئەوس و خەزرەج:

ئەوس و خەزرەج دوو هۆز بوون لە مەدینەدا، ئەو دوو هۆزە گەورەیە هەمیشە لە جەنگ و ململانێدا بوون، کوشتن و برین لە نێوانیاندا هەبوو هیچ کام حەزیان نەدەکرد یەکتر ببینن و دەیانویست یەکتری بکوژن، پێغەمبەر(ﷺ) کە هاتە مەدینە هەوڵی دا ئەو ناکۆکی و ململانێیە سەختە نەهێڵێت، چونکە ئەگەر وڵات ناکۆکی تێدا بێت ئەوا کەس ناتوانێت بە ئارامی و خۆشی بژیت بەتایبەت ئەوانەی موسڵمانان هەموویان برای یەکترن، ئەی چۆن دەوکرێت برا بکەوێتە کوشتنی براکەی پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو هۆزەکەی کۆکردەوە و رێکی خستن و بەڵێنی لێ وەرگرتن کە ئیتر بە یەکەوە جەنگ نەکەن وە وەك برای یەکتر وابن بەمە جەنگ لە نێوانیاندا نەما و هەردوو لایان بە بێ غەمی لە ماڵی خۆیاندا خەوتن.[١]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- پێویستە لەسەر ئێمەی موسڵمانان کە بە هەموو شێوەیەك هەوڵ بدەین نێوانی براکانمان چاك بکەین ئەگەر بینیمان دوو موسڵمان بە یەکەوە قسە ناکەن یان دوو هاوڕێی تریشمان ئەگەر موسڵمانیش نەبن بە یەکەوە قسە ناکەن دەبێت هەوڵ بدەین ئاشتیان بکەینەوە و بەیەکەوە قسە بکەن، چونکە هەر کەس ئەو ئیشە بکات لای خوای گەورە پاداشتێکی زۆری دەست دەکەوێت.

٢- کوشتنی برا موسڵمانەکەت زۆر تاوانە، نابێت موسڵمان لە خۆیەوە جەنگ بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەسێك بەبێ تاوان کەسێك بکوژێت ئەوا وەك ئەوە وایە هەموو مرۆڤەکانی کوشتبێت، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە بێباوەڕیش بێت نابێت لە خۆمانەوە بیکوژین ئەگینا دەچینە دۆزەخ.

منداڵانی ئازیز نابێت کەستان لەگەڵ برا موسڵمانەکەیدا بکەوێتە عادزی و قسەی لەگەڵدا نەکات چونکە ئەوە تاوانە، نابێت لە سێ ڕۆژ زیاتر بێت، ئەگەر سێ ڕۆژ زیاتر بوو بەیەکەوە

---

[١]- حبیب محمد سعید: ژیانی ژیانی ئازیزمان، بەرگە یەکەم، لاپەڕە (٤٩٨).

قسە نەکەن ئەوا هەردووکیان تاوانبارن و خوای گەورە لە تاوانەکەیان خۆش نابێت و کامیان زووتر ئاشت بێتەوە پاداشتی زیاتر بۆ ئەو کەسەیانە.

## ٤) برایەتی نێوان کۆچبەرەکان و پشتیوانەکان:

پرسیار: کۆچکەرەکان کێ بوون؟ ئەی پشتیوانەکان کێ بوون؟

وەڵام: کۆچکەرەکان ئەو موسڵمانانە بوون کە لە مەککەوە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینەو لەوێ نیشتەجێ بوون ئەوان بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچیان کردووە ماڵ و سامانی خۆیان بەجێهێشت و هاتن بۆ مەدینە، بەڵام پشتیوانەکان ئەو موسڵمانانە بوون کە خۆیان خەڵکی مەدینە بوون و هەر لە زووەوە ماڵیان لەوێ بوو، ئەوان کەوتنە یارمەتی دانی موسڵمانە کۆچکەرەکان بۆیە پێیان دەوترێت پشتیوانەکان چونکە پشتیوانی هەموو موسڵمانێکی کەم دەستی مەککەیان دەکرد.[1]

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) چۆن برایەتی خستە نێوان کۆچکەرەکان و پشتیوانەکان؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە باسکردنی برایەتی نێوان موسڵمانان و بە هەموویانی فەرموو ئا ئێوە برای یەکترن و نابێت کەستان دژی ئەوی ترتان بێت، هەر یەکەتان دەبێت یارمەتی براکەی ترتان بدەن و چیتان پێ دەکرێت بەو جۆرە کۆمەکیان بکەن، هەر موسڵمانێك دەوڵەمەندە یان نانی زۆری هەیە با یارمەتی براکەی تری بدات،[2] کچەکانتان بدەن بە موسڵمانە کۆچکەرەکان با ببن بە ژنیان ئەوانیش دەبێت رێزی کچەکانتان بگرن، هەمووتان بە یەکەوە ئیش بکەن، هەر کەستان یارمەتی برا موسڵمانەکەی بدات یان دینارێکی پێ بدات یان خورمایەك یان نانێك یان هەر شتی تری پێ بدات ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دوایی و لە بەهەشتدا دە ئەوەندەی پێ دەدات، هەندێك جاریش خوای گەورە حەوت سەد ئەوەندەی تری پێ دەداتەوە، ئەگەر شتێکتان بەخشی ئەوا با شتەکە باش بێت، ئەوەك کامە شت خراپە برۆن ئەوە ببەخشن بەڵکو بزانن خۆتان چیتان لا باشەو حەز بە چی دەکەن

[1]ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەرە (١٧١).
[2]ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەرە (٢١٣).

ئەوە ببەخشن بە موسڵمانانی تر،[١] موسڵمان دەبێت خۆی حەز لە چی دەکات حەز بکات بۆ موسڵمانەکەشی ئەو شتەی هەبێت، نابێت موسڵمانان فێڵ بکەن لە یەکتری، چونکە هەر کەس فێڵ بکات لە کەسێکی تر ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا سزای دەدات.

## ٥) نووسینی پەیماننامە یان بەڵێننامە:

پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بە ئەنجامدانی کارێکی تری گرنگ کە بریتی بوو لە نووسین و بەستنی بەڵێننامەیەکی تەواو لە نێوان موسڵمانەکان و جوولەکەکان و خەڵکی شاری مەدینەدا، چونکە لە شاری مەدینەدا موسڵمان و جوولەکە و دووڕوویش هەبوون کە هەر یەکەیان کۆمەڵێك ئارەزوو و خواستیان هەبوو.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵیدا شتێك بنووسێت کە هەموویان پێی ڕازی بن و بەو هۆیەوە بتوانن شاری مەدینە بە پێی دەستوور و یاسا ببەن بە ڕێوە، چونکە ئەگەر وڵات یاسای تێدا نەبێت ئەوا سەختە بتوانن بە ئارامش و خۆشی بژین، سەیری ئەو وڵات و شوێنانە بکە کە یاسای تێدا بەکارنایەت دەبینیت خەڵکەکەی هەمیشە دەترسن و نازانن چی بکەن و شەڕ و کوشتاری تێدایە، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەموویاندا دەستوورێکی دانا بۆ شاری مەدینە،[٣] کە تیایدا کۆمەڵێك خاڵی زۆری لەخۆ گرتبوو و هەموویان پێی ڕازی بوون و ئیمزایان کرد.

لەو دەستوورەدا بڕیار درا کە:

١- پێغەمبەر(ﷺ) گەورە و سەرکردەی شارەکە بێت، واتا ئەو فەرمان بدات.

٢- دەبێت هەموویان بەرگری بکەن لە شاری مەدینە، واتا موسڵمان و جوولەکە و ئەوانی تریش هەموویان کاتێك هێرش کرایە سەر شارەکە دەبێت بەرگری لێ بکەن چونکە هەموویان خەڵکی ئەو شارەن.

---

[١] ـ قورئانی پیرۆز: سورەتی البقرە، ئایەتی (٢٦٧).
[٢] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (١٦٦-١٦٧).
[٣] ـ عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٣٤-١٣٥).

٣- هەر کێشە و گرفتێك دروست بوو، دەبێت بێن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لە لای ئەو کێشەکە چارەسەر بکەن، نەوەك هەر لە خۆیانەوە بڕیار بدەن.

٤- هیچ کەس بۆی نیە لە خۆیەوە بڕیار بدات یان ئیشێك بکات مەگەر بێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پرسی پێ بکات، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سەرکردەیە.

٥- جوولەکەکان دەتوانن بۆ خۆیان جوولەکە بن و بە پێی ئایینی خۆیان نوێژ بکەن و بجوولێنەوە، نابێت هیچ کەسێکیش هێرشیان بکاتە سەر، واتا مرۆڤەکان سەربەستن چ ئایینێك هەڵدەبژێرن، نابێت ئێمە بە زۆر بیانکەین بە موسڵمان، بەڵام نابێت ڕێگەیان بدەین ئاژاوەگێڕی بکەن.[1]

پرسیار: سوودی ئەو دەستوورەی مەدینە چی بوو؟

وەڵام: ئەو دەستوورە سوودەکەی ئەوە بوو کە هەموو خەڵکی شارەکەی یەکخست و نەیهێشت هەر کەسە و بۆ خۆی چی دەکات بیکات، هەروەها سوودی بۆ موسڵمانەکانی داهاتوویش هەبوو تا لەوێوە فێری دەستوور بن، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بە جیا دەستوورێکی نووسی بۆ موسڵمانەکان کە تیایدا پێی فەرموون نابێت هیچ کەس خوێنی هیچ کەسی تر بڕێژێت، هەروەها نابێت هیچ کەس یارمەتی دوژمنانی ئیسلام بدات دژ بە موسڵمانان، چونکە هەر کەس ئەو ئیشە بکات ئەوا لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، هەروەها نابێت هیچ موسڵمانێك ستەم لە هیچ کەسێك بکات، هەر کەسیش ستەم بکات لە موسڵمان بێت یان جوولەکە یان هەر کەسی تر ئەوا سزا دەدرێت، دەستوورەکە شتی زۆر زۆرتری تێدابوو، بەڵام ناکرێت لێرەدا باسیان بکرێن.[2]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت ئێمە لە خۆمانەوە هیچ کارێك نەکەین، بەڵکو بزانین ئاینی ئیسلام چی دەفەرموێت بەو جۆرە بکەین، دەبێت کاتێك کێشەیەك یان ئیشێك یان پرسیارێك دێتە

[1]- د. حسن إبراهیم حسن: تأریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٨٦).
[2]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (١٧٣).

ڕێگەمان، بچین بۆ لای مامۆستایەکی ئاینی ئیسلام و لەوێ پرسیاری لێ بکەین ئەویش پێمان دەڵێت دەبێت وا بکەیت ئەو کات ئێمەش بە گوێی بکەین.

٢- ئەگەر زانیمان لە وڵاتەکەمان یاسای ئیسلامی هەیە نابێت لەو یاسایە لابدەین و دەبێت بە گوێی بکەین ئەگەرنا گوناهبار دەبین.

٣- نابێت ئێمە ستەم بکەین لە هیچ کەس تەنانەت نابێت ستەم لە جولەکە و مەسیحی و ئەوانیش بکەین، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئەوانیش بۆ خۆیان چۆن حەز دەکەن بژین و موسڵمان نەبن، ئێمە ناتوانین لە دنیادا سزایان بدەین، بەڵکو خوای گەورە سزای مرۆڤەکان دەدات، نابێت ئەگەر هاوڕێکەت جولەکە یان مەسیحی بوو، بڵێیت لێت دەدەم، بەڵکو دەبێت ڕێزی لێ بگریت و هەقت نەبێت بە سەریەوە، بەڵام ڕێگەی پێ نەدەیت کاری خراپ بکات.

## ٦) کاری جەنگی و سەربازی:

لە ئاینی ئیسلامدا زۆر باسی جەنگ کراوە، خوای گەورە فێری ئەم شتانەمان دەکات، کە دەبێت لە بارەی جەنگ کردنەوە بیزانین:

١- ئێمە دەبێت لەگەڵ کێدا بجەنگین؟

٢- ئێمە دەبێ کەی بجەنگین؟

٣- ئێمە بۆچی جەنگ دەکەین؟

٤- دەبێت لە جەنگەکەدا چی بکەین؟

١- خوای گەورە فێرمان دەکات دەبێت لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگ بکەین کە دژ بە ئاینی ئیسلام و وڵات و نیشتمان و ماڵ و سامانمانن و دەیانەوێت لەناومان ببەن یان دژایەتی موسڵمانان دەکەن.

٢- خوای گەورە فێرمان دەکات دەبێت کاتێك جەنگ بکەین کە کاتی هاتبێت و توانامان هەبێت جەنگ بکەین، هەروەها سەرکردەیشمان هەبێت، نەوەك لە خۆمانەوە.

٣- خوای گەورە فێرمان دەکات کە نابێت بۆ پارە یان بۆ شتی دنیایی یان بۆ خزمایەتی و عەشیرەتایەتی جەنگ بکەین، بەڵکو تەنها دەبێت جەنگ بکەین لە پێناوی خوای گەورەدا تا بتوانین ئاینی ئیسلام سەربخەین.

٤- خوای گەورە فێرمان دەکات کە نابێت لە جەنگدا منداڵ و ژن و پیاوی پیر و کەسانی بێتاوان بکوژین، بەڵکو دەبێت تەنها ئەو کەسانە بکوژین کە دەیانەوێت ئێمە بکوژن و جەنگمان لەگەڵ دەکەن، هەروەها نابێت درەخت و شت ببڕینەوە و نابێت ماڵ و خانوو بروخێنین، نابێت ئاژەڵیش بکوژین، کەواتە هەر کەسێك جەنگ بکات دەبێت بەو جۆرە جەنگ بکات کە خوای گەورە فەرموویەتی، نەوەك لە خۆیەوە هەستێت دەست بکات بە جەنگ کردن.

پرسیار: ئامانج چیە لە جەنگکردن؟

وەڵام: لە ئاینی ئیسلامدا بۆیە جەنگ دەکرێت تا:

١- بتوانین ڕێگە بگرین لەوەی دوژمن بمانکوژێت، نەهێڵین دوژمن ستەممان لێ بکات.

٢- تاوەکو ئاینی ئیسلام سەرخەین و ئاینی ئیسلام بلاویکەنەوە.[1]

٣- بۆ ئەوەی نیشتمانمان لەدەست دەژمنان بپارێزین.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم شتانەی فێری موسڵمانانی مەدینە کرد تا بزانن چۆن جەنگ بکەن، بە خەڵکی وت ئەگەر لەبەر پارە یان عەشیرەت و خزم جەنگ بکەن ئەوە گوناهە،[2] پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی بەرپەرچی خراپە و تاوانەکانی بێباوەڕان بداتەوە موسڵمانانی کۆکردەوە و فێری جەنگی دەکردن، یەکەجار موسڵمانەکانی دابەش کرد بۆ چەند کۆمەڵێکی بچووك کە دەچوون بۆ گەڕاندنەوەی بێباوەڕان، ئەو کۆمەڵانە پێیان دەوترا (السرية) کە بێباوەڕانیان ڕاودەنا.

[1] د. سحن إبراهيم حسن: تأريخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٨٩).
[2] محمد قطب: چۆن بانگەوازی خەڵك بکەین، لاپەڕە.

**پرسیار: سریە واتای چیە؟ وە بۆچی دەبێت؟**

وەڵام: سریە بریتیە لە کۆمەڵێك جەنگاوەری موسڵمان کە دەچن بۆ ڕاونانی بێباوەڕان تا نەهێڵن بێباوەڕان نەهێنە پێشەوە یان بجەنگن یان زیانیان پێ بگەیەنن، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو لەگەڵیاندا چونکە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بچێت لەگەڵیاندا ئەوا پێی ناوترێت سریە، ژمارەی ئەو سریانەی پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی بۆ دەوروبەر بریتی بوو لە هەشت سریە کە تیایدا جەنگێکی وا ڕووی نەدا،[1] بەڵکو تەنها ئامانج لەو سریانە ئەوە بوو کە:

١- بە بێباوەڕان نیشان بدەن کە موسڵمانان بێ ئاگا نین و ئاگایان لە خۆیانە و ڕێگە نادەن هێرشیان بکەنەسەر.

٢- تا بەرپەرچی خراپە و زیانی بێباوەڕەکان بدەنەوە.

٣- تا هەواڵی بێباوەڕەکان بزانن و بزانن بێباوەڕەکان سەرقاڵی چین.

٤- بۆ ئەوەی موسڵمانان فێری جەنگ بن، ڕابێن لەسەر کاری جەنگی.

پێغەمبەر(ﷺ) نەی دەویست لەو کاتەدا جەنگی گەورە بکات لەگەڵ بێباوەڕاندا، بەڵێ منداڵانی ئازیز: ئەمانە گرنگترین ئەو کارانە بوون کە پێغەمبەر(ﷺ) لە شاری مەدینەدا ئەنجامی دان و توانی شارەکە وا لێ بکات هەمووان حەزی پێ بکەن و بێباوەڕان زاتیان نەبێت هێرشی بکەنە سەر، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ئەم کارانەی نەکرد، بەڵکو چەند کارێکی تریشی کرد کە باسمان نەکردن وەك ئەوەی موسڵمانانی فێری بەشەکانی ئاینی ئیسلام دەکرد، نەیدەهێشت جولەکەکان ئاژاوەگێڕی بکەن ڕێگەی نەدا دووڕووەکان بکەونە خراپەکاری لەگەڵ چەندین کاری تردا کە دەتوانیت پرسیار بکەیت لە گەورەکان تا بۆت باس بکەن یان لە کتێبێکدا بیخوێنیتەوە.

[1] ـ د. علی محمد محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٥٥-٣٦٥).

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

١- یەکەم ئیش چی بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) کردی لە مەدینە؟

٢- گرنگترین ئەو شوێنانە کوێ بوون کە لە پاڵ مزگەوتی مەدینەدا هەبوون؟

٣- مزگەوت چ سوودێکی هەیە بۆ موسڵمانان؟

٤- کام هاوەڵ بوو یەکەجار فێری بانگدان بوو؟

٥- شێوازی بانگدان چۆنە لە ئاینی ئیسلامدا؟

٦- ئەوس و خەزرەج کێ بوون؟ پێغەمبەر(ﷺ) فێری چی کردن؟

٧- کۆچکەرەکان کێ بوون؟ ئەی پشتیوانەکان کێ بوون؟

٨- پێغەمبەر(ﷺ) چۆن برایەتی خستە نێوان کۆچکەرەکان و پشتیوانەکان؟

٩- پێغەمبەر(ﷺ) بۆ یەکخستنی خەڵکی مەدینە چی کرد؟

١٠- سوودی دەستووری مەدینە چی بوو؟

١١- چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگرین لە دەستووری مەدینە؟

١٢- (سریە) واتای چیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی دەناردن؟

١٣- ئامانج چیە لە جەنگکردن لە ئیسلامدا؟

١٤- ئایا دروستە ئەگەر بێباوەڕێکمان بینی لە خۆمانەوە لێی بدەین؟

١٥-ژمارەی سریەکان چەند دانە بوو؟ ئایا جەنگیان تێدا دەکرا؟

# بەشی حەوتەم

## جەنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

## جەنگی بەدر

پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك چوو بۆ مەدینە، هەندێ جەنگی ئەنجامدا لەگەڵ بێباوەڕەکانی مەککە و دەوروبەریدا و توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی کرد لەگەڵ بێباوەڕەکانی مەککە و دەوروبەریدا؟

وەڵام: چونکە:

١- خوای گەورە مۆڵەتی پێدان تا جەنگ بکەن؟

٢- بێباوەڕەکان کەوتنە ڕووخاندنی خانووی ئەو موسڵمانانەی کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە و پارە و سامانەکانیانی بردن و ژن و منداڵەکانیان دەرکردن، بۆیە موسڵمانانیش ویستیان تۆڵەی خۆیان بسەننەوە لێیان.

### * یەکەم: جەنگی بەدر:

پێغەمبەر(ﷺ) بیستی کە بێباوەڕەکانی مەککە کاروانێکی بازرگانیان بەڕێوەیە تا بچێتەوە بەرەو مەککە کە ئەبو سوفیان سەرکردایەتی ئەو کاروانەی دەکرد،[1] پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا تۆڵەی موسڵمانان لە بێباوەڕەکان بسەنێتەوە و دەست بگرێت بەسەر کەلوپەل و پارەکەیاندا لە جیاتی ئەوەی کە بێباوەڕەکان بردوویانە، پێغەمبەر(ﷺ) دوو هاوەڵی بەڕێزی ناردن تا بزانن کاروانەکە لە کوێوە و چی دەکەن و چەند کەسن، ئەوانیش چوون هەواڵیان وەرگرت و گەڕانەوە.[2] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەکرد بە هەندێ لە هاوەڵەکانی تا شمشێر و

[1]ـ عەبدول عەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٤٩).

[2]ـ د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٩١).

چەك هەڵبگرن و بچن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بۆ لێدانی کاروانەکە، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) سەرکردەیەکی دانا لە جیاتی خۆیدا تا سەرپەرشتی کاروباری مەدینە بکات.[1]

پرسیار: ژمارەی ئەو هاوەڵانە چەند بوو کە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا چوون؟

وەڵام: ژمارەی ئەو هاوەڵانە (٣١٤) سێ سەد و چواردە هاوەڵ بوو.[2]

دوو هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەر (ﷺ) هەبوون کە ویستیان بچن لەگەڵیاندا بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پێ نەدان.

پرسیار: ئەو دوو هاوەڵە کێ بوون؟ ئەی بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پێ نەدان؟

وەڵام: ئەو دوو هاوەڵە ناویان (بەڕای کوڕی عازب) و (عبداللە کوڕی عومەر) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت بڕۆن،[3] لەبەر ئەوەی تەمەنیان بچووك بوو، واتا هێشتا منداڵ بوون.

هەر سێ موسڵمان و یەك وشتریان هەبوو، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ)یش خۆی بە تەنها وشتری نەبوو، بەڵکو دوو هاوەڵی تری لەگەڵدا بوو.

کاتێك ئەبو سوفیان هەواڵی ئەوەی بیست کە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانەکان وا دێن تا لە کاروانەکەی ئەو بدەن و دەستی بەسەردا بگرن، یەکسەر ڕێگەکەی خۆی گۆڕی و چوو بەرەو کەناری دەریا و هەواڵی نارد بۆ خەڵکی مەککە و وتی: خەڵکینە وەرن وا پێغەمبەر و هاوەڵەکاتی هاتوون ماڵ و پارەکانتان ببەن.[4]

پرسیار: خەڵکی قورەیش کە هەواڵیان بیست چییان کرد؟

وەڵام: خەڵکی قورەیش کە هەواڵیان بیست تەواو تووڕە بوون و بڕیاریاندا بچن تا بە یەکجاری پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانەکان لەناو بەرن، ئەبو سوفیان نامەیەکی تری نارد بۆ

[1] ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٢٠٥).
[2] ـ ابو اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٣١٧).
[3] ـ د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٣٩٢).
[4] ـ د. حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلامي، بەرگی، لاپەڕە (٩١).

خەڵکی مەککە و وتی قەناکات مەیەن، وا کاروانەکە ڕزگاری بوو لە دەست موسڵمانەکان چونکە ڕێگاکەم گۆڕی، بەڵام خەڵکی مەککە وتیان هەر دەبێت بچین و جەنگ بکەین لەگەڵ موسڵمانەکاندا تا وایان لێ بکەین جارێکی تر نەوێرن هێرش بکەنە سەر بێباوەڕەکان.[1]

بێباوەڕەکان نزیکەی هەزار کەس بوون و گۆرانی بێژ و کچی سەماکەر و عارەق و شتیان هێنا لەگەڵ خۆیاندا وتیان تا موسڵمانەکان لە ناو نەبەین ناگەڕێینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی کە ئایا جەنگ بکەین یان نا؟ موسڵمانەکان وتیان ئێمە ئامادەی جەنگین، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەیت خۆمان بخەینە ناو دەریاوە ئەوا پیایدا تێدەپەڕین و خۆمانی تێ دەخەین،[2] بەمە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا جەنگ بکات لەگەڵ بێباوەڕەکاندا و کەوتنە ڕێ، کاتێك کە موسڵمانەکان گەیشتنە شوێنێك کە پێی دەوترێت (بەدر) لەوێ وەستان، یەکێك لە هاوەڵەکان وتی بە پێغەمبەر(ﷺ) با هەموو بیرەکان پڕبکەینەوە و تەنها یەك بیریان بهێڵینەوە، ئیتر ئەو کاتە ئێمە ئاومان دەبێت و بێباوەڕەکان تینوویان دەبێت و بە ناچاری شکست دەهێنن، پێغەمبەر(ﷺ)یش بە گوێی هاوەڵەکەی کرد و فەرمانی کرد بیرەکان پڕ بکەنەوە جگە لە یەك دانەیان،[3] بەمە موسڵمانەکان بیر و ئاویان هەبوو، بێباوەڕەکانیش ئاویان نەبوو بیخۆنەوە.

موسڵمانەکان شوێنێکیان دروست کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پێیان وت ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لێرەبە و سەیری ئێمە بکە چی فەرمانێکت هەبوو پێمانی بڵێ یان ئەگەر هەڵەیەکمان کرد ئاگادارمان بکەرەوە، تۆ مەیەرە ناو جەنگەوە با بێباوەڕەکان نەتوانن تۆ شەهید بکەن، هەروەها موسڵمانەکان چەند پاسەوانێکیان دانا لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) تا بە چاکی بیپارێزن.[4]

---

[1] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٠٦).
[2] ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٩١).
[3] ـ د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٩٧).
[4] ـ د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٠٢).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- ئێمە دەتوانین تۆڵەی خۆمان بسەنینەوە لە ستەمکاران و بێباوەڕان ئەگەر هاتوو ڕۆژێك دەسەڵاتمان هەبوو یان توانیمان جەنگ بکەین، ئەوا دەتوانین تۆڵەی خۆمان بسەنینەوە، بەڵام نابێت ستەم بکەین.

٢- نابێت منداڵانی بچووك جەنگ بکەن لە ڕاستیدا گوناهە منداڵان ببرێن بۆ جەنگ، چونکە منداڵ توانای نیە و لاوازە و زوو دەترسێت و دەکوژرێت، بۆیە نابێت بیانبەین بۆ جەنگ، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕێگەی نەدا بەو دوو هاوەڵە بەڕێزە منداڵە کە تا بچنە جەنگ کردنەوە.

٣- منداڵانی ئازیز، منداڵی موسڵمان دەبێت ئازا و دلێر و نەترس بێت، دەبێت منداڵی موسڵمان نەترسێت و هەمیشە ئامادە بێت لە پێناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)دا هەموو کارێك بکەن، سەیری ئەو دوو هاوەڵە منداڵە بکەن کە چەندە دلێر و نەترس و داوا دەکەن لە پێغەمبەر(ﷺ) تا مۆڵەتیان بدات بچنە جەنگ و جەنگ بکەن لەگەڵ بێباوەڕەکاندا، بەڵام نابێت بێ گوێی و لاساری بکەین، چونکە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێیان ئێوە منداڵن و نابێت بێن بۆ جەنگ، بە گوێی پێغەمبەر(ﷺ)یان کرد و گەڕانەوە.

٤- دەبێت ئێمە گەورە و سەرکردە و زاناکانمان بپارێزین لە دەستی دوژمنان ئیسلام و پاسەوانیان بکەین و نەهێڵین هیچ کەس دەستیان بۆ ببات و بیانکوژێت، سەیری هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن کە شوێنیان دروست کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەیان نەدا هیچ بێباوەڕێك نزیکی ئەوێ ببێتەوە، بەڵکو پاسەوانیان بۆ دانا تا کەس نەتوانێت بیکوژێت.

## * کاتی جەنگ کردنەکە:

شەو موسڵمانان خەوتن و ئیسراحەتی خۆیان کرد، پاشان کە بەیانی زوو هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەموویانی کۆکردەوە و ڕێکی خستن، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێك ڕایوەستاندن وەکو چۆن بۆ نوێژ بە ڕیز ڕادەوەستن،[1] پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ڕمێکی پێ بوو کە ریزەکانی پێ ڕێك دەکرد، لەناو ریزەکاندا کەسێك هەبوو ناوی(سواد) بوو کە لار وەستابوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕمەکە پاڵی پێوەنا و فەرمووی: سواد ڕێك بوەستە، سواخێکی کرد و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆ ئازارت دام، چۆن دەبێت پێغەمبەر وا بکات، پێغەمبەر(ﷺ)یش کراسەکەی خۆی لادا و فەرمووی هەقی خۆت بکەرەوە، بەڵام سواد بە پەلە چوو بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)و ماچی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری ئازیز تەنها ویستم بەر تۆ بکەوم،[2] چونکە تەواو تۆم خۆش دەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە قسەکردن بۆیان و فەرمووی هەرکەس ئەمڕۆ بکوژرێت شەهیدەو دەچێتەوە بۆلای خوا بۆبەهەشت و، پاداشتێکی گەورەی لە لای خوای گەورە.[3]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون کە نەترسن چونکە خوای گەورە یارمەتی موسڵمانان دەدات و فریشتە دەنێرێت تا یارمەتی موسڵمانان بدەن، هەروەك چۆن لە جەنگەکەدا خوای گەورە فریشتەی نارد بۆ یارمەتیدانیان.

پرسیار: شەهیدی واتای چیە؟

وەڵام: شەهید واتا کوژرانە لە ڕێگەی خوادا، هەر کەس شەهید بێت یەکسەر دەچێتە بەهەشت.

[1]. محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٢١٥).
[2]. ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٠١).
[3]. عبدالعزيز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٤٦).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- موسڵمان ڕێك و پێك بێت و هەمیشە بە جوانی ڕابوەستێت، بەڕێز و بەڕێكی بوەستێت سەیركەن پێغەمبەر (ﷺ) تەنانەت لە جەنگیشدا ناهێڵێت موسڵمانان لار ڕابوەستن، بەڵكو ڕیزەكانیان ڕاست دەكات.

٢- دەبێت ئێمەیش وەك موسڵمانانی زوو پێغەمبەر (ﷺ)مان خۆش بوێت.

٣- دەبێت دادپەروەر بین و ئەگەر ستەمێكمان كرد لە كەسێك پێی بڵێین تۆڵەی خۆت بسەنەرەوە.

## * دەست پێ كردنی جەنگەكە:

پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك سوپای بە ڕیز و بەڕێك و پێكی ڕاوەستاندن كەوتە دوعا كردن و لە خوای گەورە پاڕایەوە تا موسڵمانان سەربخات، سەرەتای جەنگەكە وا دەستی پێكرد كە سێ كەس لە بێباوەڕەكان هاتنە ناو مەیدانەكە، سێ كەس لە موسڵمانەكانیش هاتنە ناو مەیدانەكەوە و بە یەكەوە جەنگیان كرد و موسڵمانەكان سەركەوتن كە (حەمزە و عەلی و عوبەیدە) بوون، كاتێك بێباوەڕەكان بینیان موسڵمانەكان سەركەوتن و هاوڕێكانیان كوژران تەواو بێزار و تووڕەبوون و دەستیان كرد بە هێرش بردن بۆ موسڵمانەكان، موسڵمانەكان بە دەنگی بەرز هاواریان دەكرد (ئەحەد، ئەحەد) پاشان موسڵمانەكان هێرشیان برد و شكستێكی گەورەیان تووشی بێباوەڕەكان كرد.[1]

خوای گەورەیش فریشتەی خۆی نارد بۆ یارمەتیدانی موسڵمانەكان و توانیان زۆرێك لە بێباوەڕەكان بكوژن و دڵی موسڵمانان خۆش بكەن،[2] یەكێك لە موسڵمانەكان ویستی بە شمشێر بدات لە بێباوەڕێك ، كەچی پێش ئەوەی لێی بدات بێباوەڕەكە كوژرا، دوایی كە پرسیاری كرد لە پێغەمبەر (ﷺ)،پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕاست دەكەیت ئەوە

[1]. عەبدول عەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٦٤).
[2]. ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٥٤٢-٥٤٥).

فریشتەکانی خوا بوون کە لە ئاسمانەوە هاتن و یارمەتی موسڵمانانیان دا،[1] دوایی کە جەنگەکە تەواو بوو، موسڵمانەکان سەرکەوتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە شەهیدەکانی موسڵمانان هەر لەو شوێنەدا بنێژن و نەیان شۆن و بە جل و بەرگی خۆیان بیانخەنە ناو گۆڕ و نوێژی مردوویان لەسەر نەکەن.[2] ژمارەیەکی زۆر لە بێباوەڕەکانیش کوژران کە ژمارەیان (٧٢) کەس بوو، هەروەها (٧٢) کەسیشیان لێ بە دیل گیرا، هاوکات موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان دەستکەوت کە دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دابەشی کرد بە سەریاندا.[3]

پرسیار: ئەی بێباوەڕەکان چییان کرد؟

وەڵام: بێباوەڕەکان کاتێک بینیان گەورە و سەرکردەکانیان کوژراون و موسڵمانەکان بەهێزن، دەستیان کرد بە ڕاکردن بەرەو مەککە.

## * کوژرانی ئەبو جەهل:

دوو منداڵی جوان و موسڵمان و ڕێك و پێك كە بە نهێنی هاتبوون بۆ جەنگ، بۆیە چوون بۆ لای یەكێك لە هاوەڵەكان كە ناوی (عبدالرحمن كوڕی عەوف) بوو، پێیان وت خاڵۆ گیان بێ زەحمەت (ئەبو جەهل)مان نیشان بدە تا بزانین كامەیە و لە كوێیە، ئەویش وتی: كوڕە شیرینەكانم ئێوە ئیشتان چیە بە ئەبو جەهل؟ وتیان بیستوامنە كە ئەبو جەهل قسەی ناشرینی وتووە بە پێغەمبەر (ﷺ) و سووكایەتی كردووە بەرامبەر بە ئیسلام، بۆیە دەبێت ئەو بێباوەڕە بكوژین، عبدالرحمن وتی: كوڕەكانم ئێوە بچووكن چۆن دەتوانن بیكوژن؟ ئەوانیش وتیان تۆ نیشانمانی بدە و هیچ حەقت نەبێت دەبێت بیكوژین، ئەویش ئەبو جەهلی پێ نیشاندان و ئەوانیش بە پەلە كەوتنەڕێ، دوو منداڵەكە بە پەلە گەیشتنە لای ئەبو جەهل و هەر یەكەیان بە شمشێرێك لێیان داو خستیانە سەر زەوی و كوشتیان.

[1] - محمد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، لاپەڕە (١٦٣).
[2] - د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٤٢١-٤٢٣).
[3] - ابن الاثير: الكامل في التاريخ، بەرگی دووەمن لاپەڕە (٢٤).

دوای کە جەنگەکە تەواو بوو پێغەمبەر(ﷺ) چوویە سەر تەرمەکەی و سەیری کرد و فەرمووی: ( ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە)، [1] بەمە ئەو ئەبو جەهلەی قسەی دەوت بە پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی دوو منداڵی موسڵمان کوژرا.

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت منداڵی موسڵمان بە غیرەت و ئازا و نەترس بێت هەرچیەکی پێ دەکرێت کە چاك بێت بیکات، نابێت منداڵ وا بزانێت هیچی پێ ناکرێت.

٢- نابێت هەرگیز رێگە بدەین بە هیچ کەس قسە بڵێت بە پێغەمبەر(ﷺ) هەر کەسێك قسەی وت بە پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت بە توندی بەرپەرچی بدەینەوە، چونکە دەبێت موسڵمان پێغەمبەر(ﷺ)ی لە خۆی زیاتر خۆش بوێت، واتا ئەگەر قسە وترا بە خۆت توورە بویت، دەبێت کە قسەیش وترا بە پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە توورە بیت.

## * هەڵویستی موسڵمانان لەگەڵ گیراوەکاندا:

کاتێك موسڵمانەکان سەرکەوتن، ژمارەیەك لە بێباوەڕەکانیان بەدیل گرت، موسڵمانان نەیاندەزانی چییان پێ بکەن، ئایا بیانکوژن یان بیانهێڵنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ڕاوێژکردن بە موسڵمانان و پرسیاری لێ کردن کە ئایا چی بکەین لەگەڵ دیلە موسڵمانەکاندا؟ ئەبو بەکری صدیق فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) با نەیانکوژین، چونکە ئەگەر بیانکوژین خەڵك وا دەزانێت دڕندە و توندڕەوین، بۆیە پێم باشە نەیانکوژین، بەڵکو ئەمە و خوای گەورە ڕێنموونیان بکات بۆ ڕێگەی ئیسلام، با لە جیاتی ئازادکردنیاندا شت وەربگرین لە کەس و کارەکەیان.

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد بە عومەری کوڕی خەتاب کە چی بکەن؟ عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا با هەموویان بکوژین، چونکە ئەوان جەنگیان کردووە لەگەڵ ئێمەدا و

[1]. ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٢١-٣٢٢).

ویستوویانە ئێمە بکوژن، ئەگەر بیانکوژین ئیتر هیچ کەسێکی تر زاتی نابێت جارێکی تر هێرش بکاتە سەرمان.[1]

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ)بە گوێی قسەی کامیانی کرد؟

وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێی ئەبو بەکری صدیق و ئەو هاوەڵانەی کرد کە وتیان با نەیانکوژین، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد کە هەر دیلێك بتوانێت دە منداڵە موسڵمان فێری خوێندەواری بکات ئەوا ئازاد دەکرێت هەر کەس نەیزانی با کەس و کاری بە پارە بیکڕنەوە.[2]

پرسیار: خوای گەورە قسەی کامیانی پێ باش بوو؟

وەڵام: خوای گەورە قسەکەی فەرمووی دەبوایە ئەو بێباوەڕانەتان بکوشتایە کە لە جەنگی بەدردا بە دیلتان گرتن، کاتی عومەر چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر، سەیر دەکات هەردووکیان دەگرین، عومەر وتی: بۆچی دەگرین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چونکە خوای گەورە قسەی تۆی پێ باش بوو، کەچی ئێمە بە گوێی تۆمان نەکرد،[3] ئەبوایە هەموو ئەوە بێباوەڕانەمان بکوشتایە، لەو کاتی دیلیەی بێباوەڕەکاندا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە موسڵمانان کە لەگەڵ بێباوەڕەکاندا باش بن و لێیان نەدەن و ڕێزیان بگرن و نانیان بدەنێ و نەهێڵن تینوو بن، کەس سووکایەتیان پێ نەکات و ئەگەر دەتوانن قسەی چاکیان بۆ بکەن بۆیە موسڵمانی وا هەبوو نانەکەی خۆی لەت دەکرد لەگەڵ دیلێکدا و نیوەی خۆی دەیخوارد و نیوەکەی تری دەدا بە دیلەکە.[4]

---

[1]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٢٧).

[2]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٢٣).

[3]- عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٥٨).

[4]- عەبدول عەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٦٧).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- موسڵمان نابێت لە خۆیەوە هەموو شتێك بکات، بەڵکو دەبێت ڕاوێژ بکات بەوانی تر، سەیرکەن پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆی پێغەمبەرە کەچی ڕاوێژ دەکات بە موسڵمانان.

٢- نابێت سۆز و ڕەحمان هەبێت بۆ هەموو بێباوەڕێك، بەڵکو ئەوانەی بێ دەنگن و جەنگمان لەگەڵدا ناکەن هەقمان نیە بە سەریانەوە، بەڵام ئەو بێباوەڕانەی جەنگمان لەگەڵدا دەکەن نابێت هیچ ڕەحمیان پێ بکەین.

٣- دەبێت ئەگەر کارێکمان کرد کە وا نەبوو ، خۆمان تەمێ بکەین و هەمتر نەیکەینەوە.

٤- دەبێت ئێمە تەواو گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بین، تەنانەت ئەگەر فەرمانەکەیشمان بە دڵ نەبوو، هەر دەبێت بە گوێیان بکەین، چونکە ئەوان لە ئێمە زاناترن و چاکتر لە ئێمە دەزانن، بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك فەرمانیان پێ دەکرا ڕێزی دیلەکان بگرن، حەزیان نەدەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بوو جێبەجێیان دەکرد.

٥- ئیسلام هەمیشە ئایینێکی پاك و گەورەیە، ئاینی ئیسلام تەنانەت ڕێزی ئەو دیلانە دەگرێت کە پێشتر ویستویانە موسڵمانان بکوژن.

٦- نابێت هیچ کەس بە زۆر بکەین بە موسڵمان، سەیرکەن ئەو هەمووە دیلە لەبەر دەستی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵماناندا بوون، کەچی پێغەمبەر (ﷺ) ئامادە نەبوو بە زۆر موسڵمانیان بکات، بەڵکو وازی لێ هێنان.

ئازیزم هەر کەسێك شتێك بکات و خۆی حەزی لێ نەکات، ئەوا ئەو ئیشە سەرکەوتوو نابێت، بەڵکو دەبێت خۆی تەواو حەزی لێ بکات.

## * ئەنجامەکانی جەنگی بەدر:

١- لە ئەنجامی جەنگی بەدردا موسڵمانان سەرکەوتن و سام و شکۆیان زیادی کرد بە جۆرێك لە هەموو شوێنێکەوە دەنگ و باسی سەرکەوتنی موسڵمانەکان بڵاوبوویەوە و هەمووان بۆیان دەرکەوت کە موسڵمانانیش بە هێزن و دەتوانن بجەنگن، بێباوەڕەکان هێندە نەزان و نەفام بوون، کاتێك موسڵمانەکان لە مەککە جەنگیان نەدەکرد لەگەڵیاندا وایان دەزانی موسڵمانان ناتوانن جەنگ بکەن، بەڵام لە جەنگی بەدردا زانیان کە موسڵمانان زۆر لەوان بەهێزترن، منداڵانی ئازیز ئەگەر هاوڕێکەتان لەگەڵتان باش بوو جەنگی بەدر لەگەڵتاندا وانەزانن ناتوانێت جەنگتان لەگەڵدا بکات یان لەگەڵتاندا خراپ بێت، بەڵکو ئەو کەسە ڕێزتان دەگرێت، بۆیە ئێوەش دەبێت هەمیشە هەوڵ بدەن ڕێزی بگرن.

٢- بێباوەڕەکانی مەککە زیانێکی گەورەیان لێکەوت و لە لای خەڵك نابڕوویان چوو.

٣- جەنگەکە بوو بەهۆی کوژرانی کۆمەڵێك لە بێباوەڕەکان و شەهید بوونی کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان کە خوای گەورە بەڵێنی بەهەشتی پێدان.

## * هەوڵی کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ):

پاش ئەوەی بێباوەڕەکان تووشی ئەو شکستە گەورەیە بوون، نەیاندەزانی چۆن تۆڵەی خۆیان بسەننەوە و بڕیاریاندا پێغەمبەر (ﷺ) بکوژن.

ئەو کەسەی ویستی پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت ناوی (عومەیر) بوو کە داوای کرد لە یەکێك لە گەورەکانی قورەیش تا یارمەتی بدات، ئەو گەورەیەی قورەیش ناوی (سەفوان) بوو کە بڕیاریدا عومەیر چی بوێت ئەو پێی بدات تا پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت، عومەیر بە خۆی و شمشێرەکەیەوە چوو بەرەو مەدینە و چوو بۆ مزگەوت، عومەری کوڕی خەتاب کاتێك عومەیری بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە عومەیری خراپەکار و دوژمنی خوایە، بۆیە عومەر چوو شمشێرەکەی لەسەر ملی عومەیر دانا نەوەك زیان بگەیەنێت بە پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی عومەر وازی لێ بهێنە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی عومەیر بۆچی هاتوویت؟ عومەیر وتی هاتووم یەکێك لە دیلەکان ئازاد بکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نەخێر بۆ ئەوە نەهاتوویت، بەڵکو تۆ لەگەڵ سەفواندا قسەتان

کردووە و هاتوویت من بکوژیت، عومەیر وتی تۆ چۆن زانیت؟ خۆ هیچ کەس ئاگای لەمە نەبوو جگە لە خۆمان، بۆیە عومەیر یەکسەر موسڵمان بوو و وازی هێنا لەو کارە خراپەی، ئینجا عومەیر چوویەوە بەرەو مەککە و چوو بۆ لای سەفوان، سەفوان خۆشی بوو وای زانی عومەیر پێغەمبەر(ﷺ)ی کوشتووە، کەچی سەیری کرد عومەیر موسڵمان بووە، سەفوان زۆر بەوە تووڕە بوو.[1]

## *پەند و ئامۆژگاری:

١- هەر کەسێك دژ بە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان پلانێك دابنێت ئەوا خوای گەورە پێی دەزانێت.

٢- نابێت هەموو جارێك تووڕە ببین و هەر کەسێك هات بۆ لامان دەبێت ڕێزی بگرین، وەك پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری فەرموو واز بێنە لە عومەیر و ئازاری مەدە.

[1] د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٣٨-٤٤١).

## پرسیارەکانی بەشی حەوتەم

١- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی کرد لەگەڵ بێباوەڕەکانی مەککە و مەدینە؟

٢- کێ سەرکردایەتی کاروانی بێباوەڕانی دەکرد؟ ئەی چی کرد بە کاروانەکە؟

٣- پێغەمبەر(ﷺ) کە هەواڵی هاتنی کاروانی بێباوەڕەکانی بیست چی کرد؟

٤- پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدا دوو هاوەڵ بچن بۆ جەنگی بەدر ناویان چی بوو؟ بۆچی نەچوون؟

٥- خەڵکی قورەیش کە بیستیان موسڵمانان هێرش دەکەن چییان کرد؟

٦- موسڵمانان چیان کرد لە جەنگی بەدردا تا پێغەمبەر(ﷺ) بپارێزن؟

٧- سواد کێ بوو؟ چی وت بە پێغەمبەر(ﷺ)؟

٨- شەهید واتای چیە؟

٩- جەنگی بەدر چۆن دەستی پێکرد؟ کێ تیایدا سەرکەوت؟

١٠- ئەبو جەهل کێ بوو؟ بە دەستی کێ کوژرا؟

١١- چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگریت لە هەڵوێستی موسڵمانان لەگەڵ دیلەکاندا؟

١٢- پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕاوێژی کرد بە ئەبو بەکر و عومەر بە گوێی کامیانی کرد؟ ئەی خوای گەورە کامیانی پێ ڕاست بوو؟

١٣- گرنگترین ئەنجامەکانی جەنگی بەدر بژمێرە؟

١٤- عومەیر کێ بوو؟ لەگەڵ سەفواندا بڕیاری چیان دا؟

١٥-چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگرین لە کوژرانی ئەبو جەهل؟

# بەشی هەشتەم

## جەنگی ئوحود

لە نێوان جەنگی بەدر و جەنگی ئوحوددا چەند ڕووداوێک ڕوویاندا کە ئەمانە گرنگترینیانن:

١- پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بە ئەنجامدانی چەند جەنگێکی بچووک لەگەڵ بێباوەڕەکانی تردا، بەڵام جەنگەکان کوشتاری وایان تێدا ڕوونەدا، بەڵکو تەنها بریتی بوو لە ترساندنی دوژمنان و بێباوەڕان تا نەوێرن شاڵاو بەرنە سەر موسڵمانان، ئەو جەنگانە بە هۆی ئەوەوە بوو کە هەندێک لە هۆزەکان دەیانویست ناپاکی بنوێنن لەگەڵ موسڵمانانداا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) یەک یەک بەرپەرچی دانەوە، ئەو جەنگانە وەک مەشقی سەربازی وا بوون بۆ سەربازانی موسڵمانان.[1]

٢- جەنگان لەگەڵ جوولەکەکانی (بەنو قەینوقاع)دا: جوولەکەکانی مەدینە لە چەند هۆزێکی سەرەکی پێکهاتبوون کە یەکێک لەوانە هۆزی (بەنو قەینوقاع) بوون کە لە دوای جەنگی بەدردا ئەو پەیمان و بەڵێنەیان هەڵوەشاندەوە کە بەستوویان لەگەڵ موسڵمانەکاندا و کەوتنە کاری ناپاکی و خیانەتکردن، ئەوان زۆر ڕقیان بوو کە موسڵمانەکان سەرکەوتن، بۆیە کەوتنە قسەوتن بە موسڵمانان و ویستیان بە هەر جۆرێک بێت کارێک بکەن کە زیان بگەیەنن بە موسڵمانان،[2] بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێ نەدان و کەوتە کۆکردنەوەی موسڵمانەکان و چوو بەرەو ڕوویان تا ئەو هۆزە ناپاکە لەناوبەرێت و هەمووان فێر بکات کە ئەگەر کەسێک ناپاکی بکات ئەوا لێی دەدرێت و لەو وڵاتە دەردەکرێت،[3] ئەو جوولەکانە کەوتنە سوکایەتی کردن بە ئافرەتێکی موسڵمان، چونکە یەکێک لە ئافرەتە موسڵمانەکان چوو بۆ لای جوولەکەکان تا لەوێ شت بفرۆشێت، جوولەکەکان پێیان وتبوو دەبێت خۆت نیشان بدەیت بەڵام ئەو ڕازی نەبوویبوو یەکێک لە جوولەکەکان لە پشتەوە جلی ئافرەتە موسڵمانەکەی

[1] ـ د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٥١-٤٥٧).
[2] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٢٩-٢٣٣).
[3] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٥٩).

بەرزکردەوە و لەشی دەرکەوت و جوولەکەکان کەوتنە گاڵتەپێکردن و پێکەنین بەو ئافرەتە موسڵمانە، لەو کاتەدا موسڵمانێك لەوێ بوو یەکسەر جوولەکەکەی کوشت، جوولەکەکانیش موسڵمانەکەیان کوشتەوە،[1] پێغەمبەریش (ρ) بڕیاریدا هەموویان بکوژێت و لەناویان بەرێت چونکە سوکایەتیان کردووە بە موسڵمانان.[2] بەڵام سەرۆکی دووڕووەکان کە ناوی (عبداللە کوڕی ئوبەی) بوو داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا نەیانکوژێت و ڕێگەیان پێ بدات تا لە شارەکە بچنە دەرەوە، هەرچەندە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەدەکرد بەڵام بە گوێی کرد.[3]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێی ئەو پیاوە دووڕووەی کرد؟

وەڵام: بۆ ئەوەی دووبەرەکی و ئاژاوە نەکەوێتە شارەکەوە بەهۆی دووڕووەکانەوە، ئەو کات جوولەکەکان ماڵ و سامانی خۆیان بەجێ هێشت و لە شارەکە چوونە دەرەوە، هەموو خەڵکەکە کەوتنە نەفرین کردن لە جوولەکەکان تەنانەت دۆستەکانیشیان ڕقیان کەوت لێیان.

٣- کوشتنی هەندێك لەو کەسە بەناوبانگانەی کە دژایەتی ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانانیان دەکرد، چونکە هەندێ کەس هەن نابێت هەرگیز لێیان خۆش بیت و دەبێت بیانکوژیت، ئەو کەسانە قسەیان دەوت بە ئیسلام و بە پێغەمبەر(ﷺ) شیعریان دەوت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە موسڵمانان تا هەستن بە کوشتن و لەناو بردنی ئەو ناپیاوانە.[4]

٤- پێغەمبەر(ﷺ) لەو ماوەیەدا چوویە داوای (حەفصەی کچی عومەر) و هێنای.[5]

٥- هەروەها (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) چوویە داوای (فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ)) و هێنای، بەمە عەلی هەم ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) هەم زاوای بوو.[6]

---

[1]- ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٤٠).
[2]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٢٤).
[3]- محمد رمضان البوطي: فقه السیرة النبویة، لاپەڕە (١٧١).
[4]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٥٨-٤٦٧).
[5]- ابن قیم الجوزیة: زاد المعاد في هدي خیر العباد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٦٧).
[6]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٦٧).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- نابێت هەرگیز ڕێگە بدەین بە دوژمنان کە ئاژاوە بنێنەوە و یەکسەر دەبێت بەرپەچی هێرشەکانیان بدەینەوە.

٢- نابێت بە یەکجار هێرش بکەینە سەر هەموو دوژمنەکانمان، بەڵکو دەبێت یەك یەك.

٣- هەر کەسێك سوکایەتی بکات بە موسڵمانان یان بیەوێت ئابڕووی ئافرەت ببات دەبێت لێی قبوڵ نەکەین و هێرشی بکەینە سەر.

ئازیزان سەیرکەن پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدا ئابڕووی یەك ئافرەتی موسڵمان ببرێت، ئەی ئەمڕۆ ئابڕووی هەزاران ئافرەتی موسڵمان نابرێت؟

٤- ئەگەر زانیمان ئیشێك بکەین دەبێتە هۆی ناکۆکی و ئاژاوە لە وڵاتدا دەبێت ئەو ئیشە نەکەین ئەگەریش پێمان ناخۆش بێت، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ویستی جولەکەکان بکوژرێن بەڵام کە زانی ئاژاوە دەنێتەوە بە ناچاری نەیکوشتن.

## جەنگی ئوحود

جەنگی ئوحود ئەو جەنگە بوو لە نێوان موسڵمانەکان و بێباوەڕەکاندا ڕوویدا، لەم جەنگەدا موسلکانەکان سکشتیان خوارد و بێباوەڕەکان سەرکەوتن، ئەم جەنگە لە دوای جەنگی بەردا ڕوویدا کە پێشتر بێباوەڕەکان شکستیان خوارد، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بە جوانی باسی ئەو جەنگەمان بۆ دەکات، هەروەها باسی ئەوە دەکات بۆچی موسڵمانەکان شکستیان خوارد و سەرنەکەوتن.

## * هۆکارەکانی جەنگەکە:

بێباوەڕەکان دوای ئەوەی لە جەنگی بەدردا شکستیان خوارد هەمیشە دەگەڕان بە دوای هەلێکدا تا تۆڵەی خۆیان بسەننەوە لە موسڵمانان و تا ئابڕووی خۆیان لە ناو خەڵکدا بگێڕنەوە هەریەك لەوان بە جۆرێك خۆی ئامادە دەکرد بۆ تۆڵە سەندنەوە، چونکە کەم کەس هەبوو کە خزم و کەس و کاری لەو جەنگەدا نەکوژرابێت یان بە دیل نەگیرابێت، هاوکات ئەو

هێرشانەی کە موسڵمانەکان بەردەوام دەیانکردە سەر کاروانە بازرگانیەکانی بێباوەڕان وای لێ کردبوون کە زاتیان نەبێت کاروانی بازرگانی بڕوات بەو ڕێگەیەدا بەمە ئابووری و پارە و سامانیان دایە کزی،[١] جگە لەوە خەڵکی لە هەموو شوێنەکانەوە کەوتنە لۆمە و گاڵتەکردن بە بێباوەڕان و پێیان دەوتن ئەو موسڵمانە کەم و هەژارانە توانیان ئێوە بشکێنن،[٢] بێباوەڕەکانیش زۆر خەفەتیان دەخوارد بەو قسانە و بڕیاریاندا تۆڵە بسەننەوە و واز نەهێنن، بۆیە کەوتنە خۆئامادەکردن و چەکی زۆریان کۆکردەوە و سەربازەکانیشیان کۆکردەوە و مەشقیان پێ کردن تا ئامادە بن هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان.

پرسیار: ئایا موسڵمانەکان لەو کاتەدا چییان کرد؟

وەڵام: موسڵمانەکانیش لەو کاتەدا سەرقاڵی ئیش و خۆ بەهێزکردن بوون، ئەوان بێئاگا نەبوون لە هەوڵی بێباوەڕان، بەڵکو هەرچی هەواڵ بوو پێیان دەگەیشت.

پرسیار: موسڵمانەکان چۆن هەواڵیان پێ دەگەیشت؟

وەڵام: موسڵمانەکان لە ڕێگەی ئەو کەسانەوە هەواڵیان پێ دەگەیشت کە موسڵمان بوون و لە مەککەدا بوون کەس نەیدەزانی کە ئەوان موسڵمانن، پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرمووبوون بێباوەڕەکان ویستیان هەرچی بکەن هەواڵمان پێ بدەن.[٣]

پاشان بێباوەڕەکان لە مەککە کەتنەڕێ بەرەو مەدینە بۆ تۆڵە سەندنەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بە وردی هەواڵی جووڵانەوەی بێباوەڕانی پێ دەگەیشت کە ژمارەیان چەندە و بۆ کوێ دەچن و لە کوێدان و دەیانەوێت چی بکەن و چی نەکەن، یەکێك لەو کەسانەی کە موسڵمان بوو بێباوەڕەکان پێیان نەدەزانی ناوی (عەباس) بوو کە مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، عەباس بە نامە هەواڵی دەنارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەوت کە بێباوەڕەکان لە کوێدان و بەرەو ئەوێ دێن و ژمارەیان ئەوەندەیە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی تەواو دڵنیا بێت کەسێکی نارد تا هەواڵ بزانێت.[٤]

---

[١]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٣٩).

[٢]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٨١).

[٣]- عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٧٤).

[٤]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٨١).

## * مشت و مڕی نێوان موسڵمانان:

موسڵمانەکان کەوتنە مشت و مڕ لەسەر ئەوەی ئایا لە مەدینەدا بمێننەوە و لەوێ جەنگ بکەن لەگەڵ بێباوەڕەکاندا، یان بچنە دەرەوەی شار و لەوێ بجەنگن، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو با لە مەدینەدا بین و چاوەڕێ بکەین تا بێباوەڕان دێن، کاتێك هاتن لێرە لێیان دەدەین، چونکە ئەو کات نزیکین لە شارەکە و هەرچیەکمان ویست زوو دەستمان دەکەوێت و هەموو خەڵکەکەش یارمەتیمان دەدات،[1] بەڵام هەندێ لە موسڵمانەکان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) با بچینە دەرەوە جەنگیان لەگەڵدا بکەین باشە، تا ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بە نابەدڵی بەگوێی کردن و چوویەوە بۆ ماڵەوە تا لەوێ جل و بەرگی جەنگ بکاتە بەری، کاتێك موسڵمانەکان بینیان پێغەمبەر(ﷺ) حەز ناکات بچنە دەرەوە، وتیان ئێمە بۆچی بەو جۆرە مشت و مڕمان کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا، با بڕۆین پێی بڵێین باشە لە ناو شارەکەدا دەمێنینەوە و لێرە جەنگ دەکەین، کاتێك چوون ئەوەیان وت بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون ناکرێت، تازە بڕیار دراوە، هیچ پێغەمبەرێك جلی جەنگی نەکردووەتە بەر تا بچن بە کۆ دوژمناندا و دوایی ئەو جلە لاببات تا دوای جەنگەکە،[2] موسڵمانانیش کەوتنە خۆ ئامادەکردن و خۆ کۆکردنەوە بۆ جەنگەکە، بەڕاستی ئەو بەگوێ نەکردنەی پێغەمبەر(ﷺ) زیانێکی گەورەی دا لە موسڵمانەکان، چونکە نابێت قسە بکەین لە ڕووی قسەی پێغەمبەردا(ﷺ)، بەڵکو هەرچی وترا ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ) دەبێت یەکسەر بەگوێی بکەین و بێ دەنگ بین.

### * سوپای موسڵمانان لە مەدینە دەچنە دەرەوە:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە موسڵمانەکان تا خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی لە مەدینەدا بچنە دەرەوە بۆ جەنگ، کاتێك نیوەی شەو هات ئەو کات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد تا بەڕێ بکەون و چوون تا گەیشتنە ناوچەیەك کە پێی دەوترێت (ئوحود) چونکە شاخی

---

[1] ـ ابن الاثير: الكامل في التأريخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٤١).
[2] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٣٣٢).

نوحود لەوێدا بوو، موسڵمانەکان لەوێ وەستان،[١] هاوکات بێباوەڕەکانیش بەردەوام لە ڕێگەدا بوون و دەهاتن تا ئەوەی ئەوانیش گەیشتنە ناوچەکە و هەردوولا ئامادە بوون بۆ ئەوەی جەنگ بکەن،[٢] لەناو موسڵمانەکاندا گرفتێکی سەخت ڕوویدا لە پێش ئەوەی بگەنە شوێنەکە، ئەویش ئەوە بوو کە سەرکردەی دووڕووەکان که ناوی (عبدالله کوڕی ئوبەی) بوو هەستا بە پاشگەزبوونەوە لە جەنگەکە و وتی: ئێمە جەنگ ناکەین، بەمە هەرچی دووڕوو بوون لە جەنگەکە کشانەوە و گەڕانەوە بەرەو مەدینە، ئەمە وای کرد کە موسڵمانەکان دڵیان سارد ببێتەوە لە جەنگەکە و خەریك بوو زۆرێکیان واز بهێنن لە جەنگەکە،[٣] هەرچەندە هەندێك لە موسڵمانەکان ویستیان دووڕووەکان بگەڕێننەوە بەڵام سەری نەگرت، لەو کاتەدا هەندێك لە جوولەکەکان هاتن تا یارمەتی موسڵمانەکان بدەن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو، هەروەها هەندێك منداڵی موسڵمان هاتبوون بۆ جەنگ، پێغەمبەر(ﷺ) گێڕانیەوە و نەیهێشت لەو جەنگە بەشداری بکەن چونکە منداڵ نابێت بچێتە جەنگەوە، بەڵام چەند دانەیەکیان لەبەر ئەوەی باڵایان بەرز بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێدان،[٤] پاشان پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ڕێك کردنی سوپاکە و دابەشی کردن بەسەر شوێنەکاندا تا هەر یەکە و بە شێوەیەك جەنگ بکەن، کۆمەڵێك تیرهاوێژیشی دانا لەسەر بەرزاییەکە و فەرمووی ئەگەر ئێمە سەریش کەوتین نابێت ئێوە دابەزن تا خۆم پێتان نەڵێم،[٥] کەچی دوایی بە گوێی پێغەمبەر(ﷺ)یان نەکرد و دابەزین کە بوو بە مایەی شکست خواردنی موسڵمانەکان و شەهید بوونی زۆرێکیان، بەم شێوازە موسڵمانەکان ئامادە بوون بۆ جەنگ کردن و چاوەڕێ بوون تا بێباوەڕەکانیش بێن و هێرش بەرن و جەنگەکە دەست پێ بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) زوو زوو موسڵمانەکانی هان دەدا تا نەترسن و بە مەردانە خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ کردن.

---

[١] د. حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٩٣).
[٢] ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٧).
[٣] ابن هشام: السيرة النبوية، لاپەڕە (٦٥٣).
[٤] محمد سعيد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، لاپەڕە (١٧٨).
[٥] د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٤٨١).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- نابێت لە جەنگێکدا یان لە کارێکدا سەرکەوتین ئیتر واز بهێنین و پاڵی لێ بدەینەوە و بڵێین تەواو ئێمە سەرکەوتین، بەڵکو دەبێت بزانین دوژمنەکانمان هەمیشە لە هەوڵی تۆڵە سەندنەوەدان. بۆیە دەبێت خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

٢- ئەگەر بینیمان یان بیستمان یان هەر چۆنێك بێت زانیمان دوژمنان دەیانەوێت زیان بگەیەنن بە موسڵمانان دەبێت ئێمە هەواڵ بدەین بە موسڵمانەکان و ئاگاداریان بکەینەوە چونکە موسڵمانان برای ئێمەن.

٣- نابێت هەرگیز قسە بکەین لە قسەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەڵکو هەرچیەك فەرمایشت و فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بوو یەکسەر دەبێت بە گوێیان بکەین و هیچ بیری لێ نەکەینەوە و دڵنیابین کە فەرمانەکەیان ڕاستە ئەگەرنا ئەگەر وا نەکەین دووچاری زیان دەبین، هەروەك چۆن موسڵمانەکان کاتێك لە جەنگی ئوحوددا بە گوێی پێغەمبەر(ﷺ)یان نەکرد تووشی زیان بوون کە ئێستا باسی دەکەین.

* دەست پێکردنی جەنگەکە:

جەنگەکە لە نێوان هەردوولادا دەستی پێکرد و جەنگێکی قورس بوو لە جەنگەکەدا سەرەتا موسڵمانان بە دلێرانە و ئازایەتی جەنگیان کرد و توانیان بێباوەڕەکان بشکێنن، بێباوەڕەکان کە زانیان تووشی شکست بوون دەستیان کرد بە ڕاکردن، بەڵام کاتێك تیرهاوێژە موسڵمانەکان ئەمەیان بینی ڕایان کردە خوارەوە تا دەسکەوت کۆبکەنەوە سەرکردەکەیان پێی وتن دامەبەزن، مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرموو لە شوێنی خۆتاندا دامەبەزن تا خۆم فەرمانتان پێ نەکەم؟ کەچی ئەوان هەموو دابەزین،[1] یەکێك لە سەرکردەی بێباوەڕەکان کە ناوی خالیدی کوڕی وەلید بوو ئەمەی بینی بۆیە لە پشتەوە گەڕایەوە و بەرزاییەکانی گرت و لەو لایشەوە و بێباوەڕەکان گەڕانەوە بەمە موسڵمانەکان کەوتنە ناوەڕاستەوە، ئەملاولایان بێباوەڕەکان بوون، ئەمجارە جەنگەکە زۆر سەخت بوو تیایدا موسڵمانەکان شکستیان هێنا و

[1] عبدالعزیز پارمزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٨١-٢٨٢).

موسڵمانێکی زۆر تیایدا شەهید بوون کە ژمارەیان ٧٢ موسڵمان بوو کە لە ناو ئەو شەهیدانەدا حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدا بوو کە بە دەستی بێباوەڕەکان شەهید بوو.[١]

## ڕووداوەکانی ناو جەنگەکە

کاتێ: موسڵمانەکان لە جەنگەکەدا شکستیان خوارد یەکێك لە بێباوەڕەکان موسڵمانێکی کوشت کە شێوەی لە شێوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو ئیتر وای زانی پێغەمبەر(ﷺ)ی کوشتووە و هاواری کرد بەناو خەڵکەکەدا و وتی پێغەمبەرم کوشت، پێغەمبەر(ﷺ)یش کەوتبووە ناو چاڵێکەوە و دانی پیرۆزی خوێناوی بوو و بریندار بووبوو، موسڵمانەکانیش لە دەوروبەری نەبوون تا یارمەتی بدەن و ڕزگاری بکەن، موسڵمانەکان کاتێك ئەم هەواڵەیان بیست وایان زانی ڕاستە و تەواو خەفەتبار بوون و هەندێکیان شمشێرەکانیان فڕێدا و وازیان هێنا لە جەنگ و هەندێکیان ڕایان کرد و هەندێکی تریان وازیان نەهێنا و بەردەوام جەنگیان دەکرد،[٢] یەکێك لە موسڵمانەکان کەوتە نزیك پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی، ویستی هاوار بکات بەناو خەڵکەکەدا و بڵێت موسڵمانان پێغەمبەر(ﷺ) شەهید نەبووە و ماوە و لێرەیە وەرن بۆ لامان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو بێ دەنگ بە.[٣]

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بەو هاوەڵەی فەرموو بێدەنگ بە؟

وەڵام: چونکە بێباوەڕەکان لەو شوێنەدا بوون و ئەگەر بیانزانیایە پێغەمبەر(ﷺ) شەهید نەبووە دەهاتن بۆی و هیچ موسڵمانێکیش نەدەبوو لە دەوروبەریدا تا بیانپارێزێت جگە لەو هاوەڵە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو بێدەنگ بێت تا بێباوەڕەکان کەمێك بچنە ئەو لاوە.

عومەری کوڕی خەتاب توانی هێرشێکی توند بکاتە سەر بێباوەڕەکان و ڕاویان بنێت و دەست بگرێت بەسەر ناوچە بەرزەکاندان بەمە بێباوەڕەکان هیوایان نەما بە یەکجارەکی

---

[١]. محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٢٥٤-٢٥٦).
[٢]. عبدالعزيز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٨٩).
[٣]. د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٤٨٦).

سەرکەوتن و زانیان ناتوانن بە تەواوەتی لەناویان ببەن، لەو کاتەدا جەنگەکە گەرم بوو، یەکێك لە بێباوەڕەکان کە پێی دەوترا (وەحشی) هەستا بە شەهیدکردنی حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خەفەتی خوارد بەوە و هەمیشە لە یادی نەدەچوو،[1] حەزی دەکرد ناوی منداڵ بنێت حەمزە،[2] هەروەها هاوەڵانی تری زۆریش شەهید بوون.

هاوکات چەند کەسێك لە جوولەکەکان کە پێشتر بەڵێنیان دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ) بە پەلە کەوتنە خۆ و هاتن بۆ یارمەتی دانی موسڵمانەکان و جەنگیان کرد تا کوژران، لەو کاتەدا هەندێك لە موسڵمانەکان چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بەرگری لێ بکەن و بیگێڕنەوە بۆ بەرزاییەکە، یەکێك لەوانە ئافرەتێك بوو بە ناوی (نوسەیبەی کچی کەعب) کە زۆر ئازایانە جەنگی دەکرد بە شمشێر و بە تیر و کەوان بەردەوام دەجەنگا تا رێگە نەدات بێباوەڕان زیان بگەیەنن بە پێغەمبەر(ﷺ).[3]

یەکێکی تر لەوانە (ئەبو دەجانە) بوو، یەکێکی تریان ناوی (تەلحە) بوو کە هێندە تیری وەشاند تا چەند کەوانێکی شکاند، پێغەمبەر(ﷺ) زۆری خۆش دەویست و دوعای بۆ دەکرد،[4] هەرچەندە بێباوەڕەکان دەچوونە پێشەوە ئەو هاوەڵانە بە تیر و بە رم دووریان دەخستنەوە، تا ئەوەی هەر چۆنێك بێت پێغەمبەر(ﷺ)یان گێڕایەوە بۆ بەرزاییەکان.

بێباوەڕەکان بە دەنگی بەرز وتیان ئەوە تۆڵەی بەدرمان کردەوە و سەرکەوتین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی کوژراوەکانی ئێوە لە دۆزەخدان، بەڵام کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدان،[5] پاشان کە بێباوەڕەکان چوون پێغەمبەر(ﷺ) چوویە خوارەوە تا سەردانی کوژراوەکان بکات و بیان نێژێت لەوێ، حەمزەی بینی کە سنگی لەت کرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) زۆری خەفەت پێ خوارد، پاشان فەرمووی دوودوو بیانخەنە گۆڕەوە، کامیان قورئانی زۆر لەبەر بوو ئەوەیان پێش بخەن، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەستە پیرۆزەکانی بەرز

---

[1]- ابن قیم الجوزیة: صفة الصفوة، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٥٠-١٥١).
[2]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٩٠).
[3]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٥٧).
[4]- عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٢٨٦-٢٨٧).
[5]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و رەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (١٩١

کردەوە و کەوتە دوعاکردن بۆ شەهیدەکان،[1] بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت موسڵمانەکان بە شکست خواردوویی بگەڕێنەوە، بەڵکو موسڵمانەکانی کۆکردەوە و چەند هێرشێکی کردەوە سەر بێباوەڕەکان لە ناوچە جیاوازەکانەوە کە بێباوەڕەکان ترس دایگرتنەوە زانیان هێشتا موسڵمانەکان توانایان ماوە، هەروەها موسڵمانەکانیش خۆشیەك دایگرتنەوە و تۆزێك ورەیان پەیدا کردەوە.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) نەکەوتە تۆڕە بوون و قسە وتن بەو هاوەڵانەی کە لاساریان نواند و شوێنە بەرزەکانیان بەجێهێشت کە بویە مایەی شکست خواردنی موسڵمانەکان، بەڵکو کەوتە ئامۆژگاری کردنی موسڵمانەکان تا جارێکی تر لە خۆیانەوە ئیشی خۆ بەخۆ نەکەن.[3]

موسڵمانەکانی مەدینەیش زۆر خەفەتیان خوارد بەو هەواڵە و زۆر بیریان لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەوان کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی برا و خوشك و کوڕ و مێرد و خزمیان دەبیست زۆر خەفەتیان نەبوو، بەڵکو خەفەتیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەخوارد و یەکسەر دەیان وت هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ)مان پێ بدەن بزانین حاڵی باشە؟ ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی ئوحودی کرد و فەرمووی ئوحود شاخێکە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێت، پاشان گەڕایەوە بەرەو مەدینە.[4]

## ئەنجامی جەنگەکە

لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا کە کرا بێباوەڕەکان نەیان توانی جۆرە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنن و تۆڵەی بەدر بسێننەوە و ژمارەیەکی زۆری موسڵمانەکان شەهید بوون، هەروەها موسڵمانەکان توانیان توانای خۆیان بگێڕنەوە بەوەی دوای جەنگەکە چەند هێرشێکیان کردە

[1]- ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤٤).
[2]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٤٨-٣٥٠).
[3]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٥٢٠).
[4]- د. علی محمد الصلابی: السیرة النبویة، لاپەڕە (٥٢٢).

سەر بێباوەڕەکان و توانیان دووریان بخەنەوە، هەروەها ئەوە بوو بە ئەزموونێك بۆ موسڵمانەکان تا جارێکی تر لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لا نەدەن.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بین ئەوا لە هەموو کاتێکدا سەرکەوتوو دەبین، موسڵمانەکان لە جەنگی ئوحوددا کاتێك لە سەرەتاوە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون سەرکەوتن، بەڵام لە دواییدا کاتێك لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لایاندا و لە بەرزاییەکان دابەزین، موسڵمانەکان شکستیان خوارد.

٢- نابێت ئەگەر بێباوەڕەکان هەواڵێکیان بڵاوکردەوە یان قسەیەکیان کرد یەکسەر باوەڕیان پێ بکەین، چونکە کەسی بێباوەڕ لای ئاساییە درۆ بکات، بەڵام موسڵمان نابێت درۆ بکات، سەیرکەن کاتێك هەواڵیان بڵاوکردەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)یان شەهید کردووە موسڵمانەکان باوەڕیان کرد کەچی وانەبوو درۆیان کرد.

٣- پێویستە بە دڵ و بە گیان پارێزگاری زانایان و سەرکردە ئایینیەکان بکەین و نەهێڵین بێباوەڕان زیانیان پێ بگەیەنن، بەڵکو خۆمان بدەینە بەردەمیان تا ئێمە بکوژرێین لە جیاتی ئەوان، چونکە ئێمە تەنها خۆمانین، بەڵام زانایان و سەرکردە موسڵمانەکان سوودیان بۆ هەموو موسڵمانان هەیە و ئەگەر شەهید بن زیان بە هەموو موسڵمانان دەکەوێت.

٤- دەبێت سەرکردەکانیش خۆیان بە گەورە دانەنێن و خۆیان جیا نەکەنەوە بەڵکو دەبێت وەك پێغەمبەر(ﷺ) بکەن کە خۆی لە جەنگەکەدا بەشداری کرد و برینداریش بوو، نەوەك بچێت لە دوورەوە دابنیشێت و یان لە مەدینەدا بوایە و نەهاتایە بۆ جەنگەکە.

[1] ـ د. حسن ابراهیم حسن: تاریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٩٣-٩٦).

# پرسیارەکانی بەشی هەشتەم

١- گرنگترین ئەو ڕووداوانە چی بوون کە لە نێوان جەنگی بەدر و ئوحوددا ڕوویاندا؟

٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێی عبداللە کوڕی ئوبەی کرد و جوولەکەکانی نەکوشت؟

٣- دەتوانیت بە کورتی باسی هۆکارەکانی جەنگی ئوحود بکەیت؟

٤- کاتێك بێباوەڕەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ موسڵمانەکان چییان کرد؟

٥- موسڵمانەکان چۆن هەواڵی بێباوەڕەکانیان دەزانی؟

٦- ئەو کەسەی هەواڵی دەنارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ناوی چی بوو؟

٧- کاتێك موسڵمانەکان مشت و مڕیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا، پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟

٨- پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانەکان لە مەدینە چوونە دەرەوە چوون بۆ کوێ؟

٩- سەرەتای جەنگەکە چۆن دەستی پێکرد و کێ سەرکەوت؟

١٠- خالیدی کوڕی وەلید کێ بوو؟ ئەی چی کرد لە جەنگەکەدا؟

١١- کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت، موسڵمانەکان چیان کرد؟

١٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت هاوەڵەکەی لای هەواڵ بدات پێغەمبەر(ﷺ) زیندووە؟

١٣- پێغەمبەر(ﷺ) چۆن وەڵامی بێباوەڕەکانی دایەوە کاتێك وتیان تۆڵەی بەدرمان سەندەوە؟

١٤- عومەری کوڕی خەتاب چۆن توانی ناوچە بەرزەکان بگێڕێتەوە؟

١٥- چ پەند و ئامۆژگاریەك وەردەگریت لە ڕووداوی جەنگی ئوحود؟

١٦- ئەنجامی جەنگەکە چی بوو؟

# بەشی نۆیەم

# لە جەنگی ئوحودەوە تا دوای جەنگی خەندەق

کاتێك جەنگی ئوحود تەواو بوو، بێباوەڕان لە هەموو شوێنێکەوە کەوتنە هەوڵی ئەوەی خۆیان کۆبکەنەوە تا موسڵمانان لە ناو بەرن، چونکە پێیان وابوو موسڵمانان تەواو لاواز بوون و ناتوانن ئیتر جەنگ بکەن،[1] کەچی نەیاندەزانی خوای گەورە دینی خۆی سەردەخات، هەر جارە و دەستەیەك سەری هەڵدەدا تا هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سوپای موسڵمانانی دەنارد بۆیان تا ڕێگە نەدات هیچ بکەن دژ بە موسڵمانان.[2]

## * ڕووداوێکی دڵتەزێن:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتدا بوو، خەڵکی دوو هۆزی بێگانە و دوور هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەلامیان کرد و دانیشتن، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ناو ئێمەدا موسڵمانێکی زۆر هەیە، جا داوات لێ دەکەین کۆمەڵێك لە هاوەڵە زاناکان بنێریت لەگەڵماندا تا لەوێ فێری کاروبار و زانیاریە ئیسلامیەکانمان بکەن، پێغەمبەر(ﷺ)یش دڵخۆش بوو، کۆمەڵێك موسڵمانی ناردن کە قورئانی باشیان دەزانی و شارەزایی زۆریان هەبوو لە ئاینی ئیسلامدا.

هەموویان پێکەوە کەوتنەڕێ، کەچی لە نیوەی ڕێگەدا خەڵکی هۆزەکان کە پێشتر هاتبوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فێڵیان کرد و کەوتنە شەهیدکردنی موسڵمانەکان و هەندێکی موسڵمانەکانیشیان فرۆشت بە بێباوەڕەکانی مەککە و ئەوانیش شەهیدیان کردن، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی بیست تەواو نیگەران بوو و خەفەت دایگرت.[3]

---

[1]ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٦٣-٢٦٨).

[2]ـ عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٩١).

[3]ـ ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٧١-٣٧٢).

پرسیار: ژمارەی ئەو هاوەڵانە چەند بوون و کێ سەرکردەیان بوو؟

وەڵام: ژمارەی ئەو هاوەڵانە دە موسڵمان بوون و سەرکردەکەیان ناوی عاسم بوو.[1]

کاتێك بێباوەڕەکان کەوتنە کوشتنیان عاسم بە شمشێرەکەی جەنگی لەگەڵ کردن تا ئەوەی خەریك بوو شەهیدی بکەن، دوعای کرد خوایە گیان تەرمەکەم نەکەوێتە دەستی ئەوانە، کاتێك شەهیدیان کرد و ویستیان بڕۆن تەرمەکەی بهێنن، بەڵام خوای گەورە ڕێگەی پێ نەدان و تەرمەکەی شاردەوە.[2]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- نابێت متمانە بکەین بە هەموو کەسێك چونکە خەڵکی وا هەن زۆر خراپن.

٢- خوای گەورە دوعای بەندەکانی خۆی وەردەگرێت بەڵام نابێت ئێمە پەلە بکەین و بڵێین بۆچی گیرای نەکرد، بەڵکو خوای گەورە خۆی چاکتر دەزانێت.

٣- لێرەوە دەزانین کە پێغەمبەریش(ﷺ) غەیب نازانێت.

## ژن هێنانی پێغەمبەر(ﷺ):

لەو ماوەیەدا پێغەمبەر(ﷺ) دوو ژنی هێنا، کە یەکێکیان ناوی دایکی سەلەمە بوو،[3] یەکێکی تریان ناوی زەینەب بوو، دایکی سەلەمە کە موسڵمان بوو لە مەککەوە ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، کەچی بێباوەڕەکان خۆی و کوڕەکەیان گرت و بە جیا کردنیانە سجنەوە، باوکی سەلەمەیش کە مێردی دایکی سەلەمە بوو بە تەنها کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام لە دواییدا مرد و دایکی سەلەمە بێ مێر مایەوە.

باوکی سەلەمە دوعای کردبوو بۆ ژنەکەی وتبووی خوایە گیان ئەگەر من مردم پیاوێکی لە من باشتر و باوەڕدارتر ببەخشیت بەم ژنە، ئەوە بوو کە مرد دایکی سەلەمە دەیوت جا

---

[1] د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٥٣٣).
[2] عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (٢٩٨).
[3] ابن قيم الجوزية: زاد المعاد في هدي خير العباد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٦٧).

کێ هەیە لە باوکی سەلەمە چاکتر بێت، تا ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) چوویە داوای دایکی سەلەمە و هێنای.[1]

## * لە دایك بوونی حەسەنی کوڕی عەلی:

لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا حەسەنی کوڕی عەلی لە دایك بوو، پێغەمبەر(ﷺ) باپیرەی حەسەن بوو، حەسەن کوڕێکی زۆر ڕێك و پێك و باوەڕدار دەرچوو.

کاتێك حەسەن لە دایك بوو، باوکی ناوی نا (حەرب)، واتا: جەنگ، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك هات بۆ ئەوێ ناوەکەی گۆڕی بۆ (حەسەن) واتا: چاك و باش، پاشان لە خۆشی ئەوەدا مەڕێکیان سەربڕی و دابەشیان کرد بە ناو خەڵکەکەدا.[2]

پرسیار: حەسەن برایەکی هەبوو ناوی چی بوو؟

وەڵام: ناوی براکەی حەسەن بریتی بوو لە (حوسەین) کە دوایی شەهید کرا.

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- ژن هێنانی گەورەکانمان سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)ە، نابێت ئێمەی منداڵ ڕقمان بێت ئەگەر گەورەکانمان ژنیان هێنا، بەڵکو دەبێت خۆشیمان بێت چونکە سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)ە.

٢- تا دەتوانین با دوعای خێر بکەین و دڵنیا بین خوا قبووڵی دەکات، سەیرکەن کاتێك باوکی سەلەمە دوعای کرد بۆ دایکی سەلەمە خوای گەورە چۆن قبووڵی کرد.

٣- پێویستە ناوی جوان و ڕێك و پێك بنێین لە منداڵەکانمان، نەوەك ناوی توند و خراپیان لێ بنێین، ئەگەریش منداڵێك ناوەکەی خراپ و ناشرین بوو دەبێت بیگۆڕین.

---

[1] د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٥٤٣-٥٤٤).

[2] د. علي محمد الصلابي: السيرة حسن بن علي بن ابي طالب، لاپەڕە (١٩-٢٠).

## * زەید فێری زمانی جوولەکەکان دەبێت:

زەید هاوەڵێکی بەرێز و بچووکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، هەر بە منداڵی چەند سورەتێکی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردبوو، دایك و باوکی بردیان تا بکەوێتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، زەید هەموو جارێك سەرقاڵی خزمەتکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و نیشی بۆ دەکرد.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە زەید کە فێری زمان و نوسینی جوولەکەکان ببێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەترسا کاتێك رێککەوتن بکات لەگەڵ جوولەکەکاندا فێڵی لێ بکەن.[2]

زەیدی تازە پێگەیشتووی گورج و گۆڵ دەستی کرد بە فێربوون و لە ماوەی پانزە رۆژی تەواودا بە جوانی فێری زمان و نووسینی جوولەکەکان بوو و ئەو کات هاتەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تا گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو ئازیزە بێت.[3]

## * دەرکردنی جوولەکەکانی بەنو (نضیر):

یەکێکی تر لە هۆزەکانی جوولەکەکان ناوی بەنو(نضیر)بوو، کەوتنە هەوڵێکی خراپ و دڕندانە دژ بە پێغەمبەر(ﷺ)و ویستیان شەهیدی بکەن، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لایان تا رێککەوتنیان لەگەڵدا بکات، ئەوان پلانێکیان دانا کە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت، یەکێکیان بەدرێکی گەورە لە سەرەوە بخەنە خوارەوە بەسەر پێغەمبەر(ﷺ)دا و شەهیدی بکەن.[4]

بەڵام خوای گەورە ئاگاداری پێغەمبەر(ﷺ)ی کردەوە و پێغەمبەر(ﷺ) بە پەلە لەو شوێنە لاچوو و گەڕایەوە بۆ مەدینە و بڕیاریدا هێرشیان بکاتە سەر لەبەر ئەوەی پەیمانەکەیان شکاند، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە هەڕەشە کردن لە جوولەکەکان و پێی فەرموون تا بچن و ئەو

[1]ـ عبدالرحمن رعفت الباشا: صور من حياة الصحابة.
[2]ـ خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، لاپەرە(٢٩٧-٣٠٥).
[3]ـ عبدالرحمن رعفت الباشا: صور من حياة الصحابة.
[4]ـ محمد رمضان البوطي، فقه السيرة النبوية، لاپەرە (١٩٠).

شوێنە بەجێ بهێڵن ئەگەرنا هەموویان دەکوژێت، بەڵام عبداللە کوڕی ئوبەی سەرکردەی دوو ڕووەکان هەواڵی بۆ ناردن کە نەچن و دانیشن، چونکە هەموو دووڕووەکان یارمەتیان دەدەن.

پێغەمبەر(ﷺ) گەمارۆی جولەکەکانی دا و هەموویان خەریك بوو بمرن، تا ئەوەی سەرۆکی دووڕووەکان قسەی کرد لەگەڵیاندا و بڕیاریاندا بچنە دەرەوە، بەمە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێ نەدان بچنە دەرەوە و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- پێویستە منداڵی موسڵمان تا دەتوانێت قورئان فێر ببێت.

٢- با تا دەتوانین بکەونە خزمەتکردنی زانایانی موسڵمان، وەك چۆن زەید خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد.

٣- پێویستە موسڵمان خۆی فێری زمانی تر بکات وەك: فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی و تورکی و زمانەکانی تر.

## * چەند جەنگێکی تری پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) چەند جەنگێکی تری کرد لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەڵام زۆر گەورە و بەهێز نەبوون، یەکێك لەوانە ئەوە بوو کە چوو بۆ لێدانی ئەو هۆزە ناپاکانەی کە هەستان بە شەهیدکردنی موسڵمانەکان، پێغەمبەر(ﷺ) چوو لێیدان و دوژمنەکان ڕایان کرد بۆ شاخەکان و موسڵمانەکان سەرکەوتن،[2] پاشان پێغەمبەر(ﷺ) لەوە نەوەستا هەستا بە کۆکردنەوەی موسڵمانان و کەوتەڕێ بەرەو ناوچەی بەدر و لەوێ بە خۆی و سوپاکانیەوە وەستا.

پرسیار: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ بەدر و لەوێ وەستا؟

وەڵام: چونکە بێباوەڕەکان بەڵێنیان دابوو لەو کاتەدا بێن بۆ بەدر و جەنگ بکەن لەگەڵ موسڵماناندا، کەچی بێباوەڕەکان پاشگەزبوونەوە و نەهاتن بۆ جەنگەکە و موسڵمانەکان

[1] ـ ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٩-٨٦-٨٧).
[2] ـ د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٥٦٢-٥٧٠).

سەرکەوتن، بێباوەڕەکان دڵیان چوویبوویە سەر خۆشی و کامەرانی ئەو ساڵە و نەهاتن بۆ جەنگەکە، پێغەمبەر(ﷺ)یش سوپاسی خوای گەورەی کرد و لەگەڵ موسڵمانەکاندا بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە.[1]

جەنگی سێیەمیان جەنگێکی ترسناك بوو کە ئەویش جەنگ کردن بوو لەگەڵ ئەو هۆزە خراپ و ستەمکارانەی لەسەر دەسەڵاتی ڕۆمە بەهێزەکان بوون، ئەو هۆزانە کەوتبوونە هێرش کردنە سەر کاروانە بازرگانیەکانی موسڵمانەکان و خۆیان ئامادە کرد تا بچن بەرەو مەدینە و ئەو ناوچانە داگیر بکەن.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) سوپایەکی بەهێزی موسڵمانەکانی ئامادە کرد و کەوتنەڕێ بەرەو ئەوێ و هێرشی کردە سەریان و توانی سەرکەوێت بە سەریاندا، ئەمەش شتێکی سەخت بوو، چونکە هیچ کات عەرەب زاتیان نەبوو جەنگ بکەن لەگەڵ ڕۆمەکاندا، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی کردە سەریان و ڕێگەی پێ نەدان بکەونە ستەمکاری.[3]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- هەر کەسێك ناپاکی بکات لە ڕووی موسڵماناندا، ئەوا دەبێت لێی بدرێت و ڕێگەی پێ نەدرێت.

٢- نابێت موسڵمان بترسێت لە هەڕەشەی بێباوەڕان و پشت ببەستێت بە خوا.

٣- هەرچەندە دەسەڵاتی ستەمکاران بەهێز بێت، بەڵام موسڵمان نابێت ئامادەبێت ستەمکار بەدڵی خۆی ستەم بکات لە خەڵك، بەڵکو دەبێت دەستی کەسی ستەم لێکراو بگرێت و سەری بخات بۆ لەناوبردنی ستەمکاران.

---

[1] ـ ابن اثیر: الکامل في التأریخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٦٢).
[2] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٢٨٢).
[3] ـ د. علي محمد الصلابي: السیرة النبویة، لاپەڕە (٥٧٠).

## * جەنگی بەنی موستەلەق:

بەنی موستەلەق هۆزێك بوون لە هۆزی خوزاعە، ئەوان کەوتنە دژایەتی کردنی موسڵمانان و دژایەتیان لە ڕووی موسڵمانەکاندا، چونکە ئەو هۆزە لە کاتی جەنگەکانـدا هەڵدەسـتان بـە یارمەتیدانی بێباوەڕەکانی مەککە دژ بە موسڵمانەکان، هەروەها کەوتبوونـە بڕینـی ڕێگـەی موسڵمانەکان، موسڵمانەکان نەیاندەتوانی بچن بەرەو مەککەی شوێنی جارانی خۆیـان، جگـە لـەوەیش دەیانویسـت هێـرش بکەنەسـەر موسـڵمانان، بۆیـە پێغەمبـەر(ﷺ) موسـڵمانانی کۆکردەوە و هێرشی کردنە سەر و سەرکەوت بە سەریاندا و زۆرێکی لێ بەدیل گرتن.

## ژنهێنانی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك سەرکەوت بەسەر ئەو هۆزانەدا، ئەوکات یەکێك لە کچەکانی ئـەو هۆزەی هێنا کە ناوی جوەیریە بـوو، کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو ژنـەی هێنـا هەسـتا بـە ئازادکردنی نزیکەی دووسەد کەس لە دیلەکانی ئەو هۆزە تا ئـەو هـۆزە دڵیـان بچـێتە سـەر ڕەفتاری جوانی موسڵمانان، دوایی بە هـۆی ئـەو ژنهێنانـەوە هۆزەکـە هـەموویان موسـڵمان بوون.[1]

## * دووڕووەکان درۆ هەڵدەبەستن بۆ عائیشە(رضي الله عنها):

پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر جەنگێکدا دەچوویە دەرەوە یەکێك لـە خێزانـەکانی خـۆی دەبـرد لەگەڵ خۆیدا تا لە جەنگەکەدا لەگەڵیاندا بێـت، ئـەمجارەیان عائیشـەی بـرد لەگـەڵ خۆیـدا، عائیشە(ڕ) لەناو چوارچێوەکەیدا دادەنیشت لەسەر وشترێك کـە بـە پـەردە داپۆشـرابوو، لـە ڕێگەدا عائیشە(ڕ) دابەزی، کەچی موسڵمانان وایان زانی سوار بۆتەوە و چـوون عائیشـە(ڕ) بەجێما، کاتێك عائیشە(ڕ) گەڕایەوە تا سوار بێت سەیری کـرد بـەجێ مـاوە، بۆیـە لـەوێ دانیشت تا بێنەوە بەشوێنیدا، یەکێك لە پیاوە موسڵمانەکان لە دواوە بوو کە عائیشەی بینی سواری وشترەکەی کرد و بردیەوە بۆ لای موسڵمانەکان.[2]

---

[1]. عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٢١١-٢١٢).

[2]ـ ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٨٤٥-٨٤٦).

بەڵام دووڕووەکان هەواڵیان بڵاو کردەوە، کە عائیشە(ڕ) و ئەو پیاوە پێکەوە کاری خراپەیان کردووە، ئیتر هەرچی خەڵك باسی ئەوەیان دەکرد، تا خوای گەورە ئایەتی دابەزاند و فەرمووی ئەوانە درۆ دەکەن و دەبێت سزا بدرێن چونکە عائیشە(ڕ) پاکە.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

دەبێت باوەڕ نەکەین بە قسەی ناو خەڵك کە لە خۆیانەوە دەیکەن و بڕۆین بزانین وایە یان نا، نەوەك بیستمان باوەڕ بکەین و بڕۆین لە لای خەڵکی تر باسی بکەین، چونکە ئەوە گوناهێکی گەورەیە.

## * جەنگی خەندەق (ئەحزاب):

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) یەك یەك جولەکەکانی لە مەدینەدا دەرکرد بە هۆی ئەوەی پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە، جوولەکەکان بیریان لەوە دەکردەوە چۆن تۆڵەی خۆیان بسێننەوە، بۆیە بڕیاریاندا لە هەموو شوێنەکانەوە سەرباز کۆبکەنەوە و هەموویان بە یەکەوە هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، جوولەکەکان چوون بۆ مەککە و لەوێ پێیان وتن ئێمەش یارمەتیتان دەدەین با پێکەوە هێرشێکی بەهێز بکەینە سەر موسڵمانەکان، بێباوەڕەکانیش ڕازی بوون، پاشان جوولەکەکان چوون بۆ لای هۆزێك کە پێیان دەوترێت(غەتفان)، ئەم هۆزە ڕقیان نەبوو لە موسڵمانەکان، بەڵام بۆیە ئامادەبوون جەنگ بکەن لەگەڵ موسڵمانەکاندا تا پارە و سامانێکی زۆری موسڵمانەکان ببەن بۆ خۆیان، پاشان جوولەکەکان پەیوەندیان کرد بەو جوولەکانەوە کە لە شاری مەدینەدا مابوونەوە و وایان کرد کاتێك ئەمان هێرشیان کرد ئەوانیش یارمەتیان بدەن، بەمە خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەوە تا هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، ناوی ئەو جەنگەش بریتی بوو لە جەنگی (ئەحزاب).[2]

پرسیار: جەنگی ئەحزاب لە ساڵی چەندی کۆچیدا ڕوودیدا؟

وەڵام: جەنگی ئەحزاب لە ساڵی ٥ ی کۆچیدا ڕوودیدا.[3]

---

[1]. د. حسن ابراهیم حسن: تأریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٠٥).
[2]. عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (٣٢١-٣٢٢).
[3]ـ ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٣٩٢).

لەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەم شتانەی بۆ دەهات و کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشە و موسڵمانەکانی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێ کردن، بێباوەڕەکان بەرێکەوتن بۆ مەدینە و بەردەوام نزیك دەبوونەوە، لەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ)یش موسڵمانەکانی کۆکردەوە تا بە یەکەوە قسە بکەن لەسەر ئەوەی چۆن بەرپەرچی ئەو هێرشە بدەنەوە کە دێت بەرەو ڕوویان.

یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە ناوی سەلمان بوو و فارس بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) با لە چواردەوری شارەکەدا خەندەق لێ بدەین.[1]

پرسیار: خەندەق واتای چیە؟

وەڵام: خەندەق بە واتای چاڵی قووڵ و پان دێت کە بە دەوری شارەکەدا هەڵی بکەنن دوژمنان ناتوانن لە چاڵەکەوە بپەڕنەوە و بێنە ناویەوە.

## * هەڵکەندنی خەندەقەکە:

پێغەمبەر(ﷺ) قسەکەی سەلمانی پێ باش بوون بۆیە موسڵمانەکانی دابەش کرد بەسەر ئیشەکەدا و دەستیان کرد بە هەڵکەندنی خەندەقەکە، پێغەمبەر(ﷺ)یش سەرپەرشتی دەکردن و خۆشی لەگەڵیاندا ئیشی دەکرد و دانەدەنیشت.[2]

ئەو کاتانە زۆر سەخت بوون چونکە ئاو و هەوا زۆر سارد بوو، موسڵمانەکانیش نانیان زۆر کەم بوو بۆ خواردن و هەموویان توشی برسێتیەکی زۆر ببوبوون، هەر کاتێك موسڵمانێك زۆر ماندوو ببوایە بیویستایە واز بێنێت لە ئیشەکەی سەیری پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد، کاتێك دەیبینی ئیش دەکات ئەمیش دەستی دەکردەوە بە ئیش کردن، هەروەها هەر کەس کارێکی گرنگی هەبووایە دەهات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی وەردەگرت و دەچوو، بێباوەڕەکان و جوولەکەکان هاتن بینیان ڕێگە نیە بپەڕنەوە، ناچار لەو بەرەوە کەوتنە چاوەڕوانی،

---

[1]. خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، لاپەڕە(٤٨٣).

[2]- د. علي محمد الصلابي: السيرة النبوية، لاپەڕە (٥٩٣).

دوورووەکانیش ترسان و وتیان ئێمە دەچینەوە ماڵەوە، ژن و منداڵە موسڵمانەکانیش بە یەکەوە لە شێوێنێکی باش بوون تا کەس نەتوانێت زیانیان پێ بگەیەنێت،[١] بەڵام جوولەکەکانی ناو مەدینە کەوتنە خۆ ئامادە کردن بۆ جەنگ دژ بە موسڵمانەکان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی لێ گرتن، بێباوەڕەکان خەریك بوو بێزار دەبوون و نەیاندەزانی چی بکەن،[٢] پێغەمبەر(ﷺ)یش پلانێکی دانا بۆ دوژمنەکان کە توانی شکستیان پێ بهێنێت، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە بە نهێنی سەرکردەکانی غەتفانی بانگ کرد و لەگەڵیاندا ڕێککەوتن کە ئەگەر بگەڕێنەوە و واز بهێنن لە جەنگ کردن دژ بە موسڵمانان، ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) لە سێ بەشی خورمای مەدینەدا بەشێکی دەدات بەوان، بەڵام دوایی هاوەڵەکان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) با هیچیان پێ نەدەین و جەنگیان لەگەڵدا بکەین، پێغەمبەر(ﷺ)یش بە گوێی کردن، هەروەها یەکێك لەوانە موسڵمان بووبوو، بەڵام کەسیان پێیان نەزانی بوو، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من موسڵمان بووم ئێستا چی بکەم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ نێوانی ئەو بێباوەڕانە تێك بدە.

ئەویش چوو و نێوانی بێباوەڕەکانی تێکدا و هەموویان کەوتنە ڕق و کینە لە یەکتر، بەمە ئەو بێباوەڕانە توشی شکستیەکی گەورە بوون و ڕیزەکانیان ناکۆکی تێکەوت، پاشان خوای گەورە ڕەشەبایەکی توندی نارد بۆ سەر بێباوەڕەکان و دار و دیوار و چادر و هەموو شتەکانیان تێکچوو و نەیان زانی چۆن و لە کوێوە ڕابکەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەجارەیان سەرەی ئێمەیە هێرشیان بکەینە سەر بەمە بێاوەڕەکان هێرشەکەیان شکستی خوارد و خوای گەورە موسڵمانەکانی سەرخست و تێی گەیاندن کە سەرکەوتن لە لای خوای گەورەیە.[٣]

---

[١]. عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەڕە (٣٢٤-٣٢٥).
[٢]. محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٣٠٠-٣٠١).
[٣]- ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٣٩٩-٤٠٠).

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا تۆڵە بسێنێتەوە لەو جوولەکانەی لە مەدینەدا بوون و ناپاکیان کرد و کەوتنە یارمەتیدانی جوولەکەکانی تر و بێباوەڕەکان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بگیرێن و بە توندی سزای دان.[1]

## ڕووداوەکەی (حذیفة):

حوزەیفە هاوەڵێکی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کاتێك هێشتا بێباوەڕەکان لە جەنگدا بوون لەگەڵ موسڵمانەکاندا، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی هەواڵی بێباوەڕەکان بزانێت و بزانێت چی دەکەن، بۆیە ویستی کەسێك بنێرێت بۆ ناویان تا هەواڵ بهێنێت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەچێت هەواڵ بهێنێت لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ مندا دەبێت، بەڵام هەوا ئەوەندە سارد بوو و دنیا تاریك و ترسناك بوو، هیچ کەس نەبوو زاتی هەبێت بڵێت من و بڕوات، بۆیە ئەمجارەیان پێغەمبەر(ﷺ) بە حوزەیفەی فەرموو تۆ بڕۆ و هەواڵ وەربگرە بەڵام لە خۆتەوە پەن نەدەیت، ئەویش بە گوێی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد و چوو و بە دزیەوە چوویە ناویان و هەواڵی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵەکەی بۆ هێنا.

حوزەیفە دەڵێت کاتێك چووم سەرۆکی بێباوەڕەکان نزیك بوو لێمەوە و دەمتوانی بە تیرێك بیکوژم و ویستم بیکوژم، بەڵام کاتێك بیرم کردەوە لە فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە بۆچی ناردوومی و چی پێ فەرمووم، وازم هێنا و نەمکوشت، کاتێك کە جەنگەکە تەواو بوو و موسڵمانەکان سەرکەوتن و جوولەکەکانیشیان لەناو بردن، ئەو کات دووڕووەکان لە ماڵیان هاتنە دەرەوە و نەیاندەزانی چی بکەن.[2]

---

[1] ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٣٠-١٤٠).

[2] ـ د. علي محمد الصلابي: السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٠٧-٦٠٨).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- جولەکە هیچ کات واز ناهێنن لە موسڵمانان و لە هەموو کات و شوێنێکدا هەوڵ دەدەن پیلان دابنێن بۆ لەناوبردنی موسڵمانان، ئەوان هەرجارە و ڕێگەیەك دەگرنەبەر، بەڵام هەرچی دەکەن لە کۆتاییدا سەرناکەون و خوا دەیانشکێنێت.

٢- خەڵکانێك هەن تەنها حەزیان لە ماڵ و پارە و سامانە، کەچی بیر لەوە ناکەنەوە کە پارە و سامان تەنها لە دنیادایە و ڕۆژێك دێت دەمرن و چی پارە و سامانە بەجێی دەهێڵن، سەیری غەتفان بکە کە لەبەر پارە کەوتنە جەنگ کردن لەگەڵ موسڵماناندا.

٣- ڕاوێژکردن بە دەوروبەر کارێکی زۆر گرنگە و ئیسلام بە پێویستی داناوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت کە ڕاوێژ بە دەوروبەرەکەت بکە، سەیری پێغەمبەر(ﷺ) بکەن کە لە کاتی ئەو جەنگەدا ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی و گوێی لێ گرتن و بە گوێی قسەکەی سەلمانی فارسی کرد و خەندەقەکەیان هەڵکەند.

٤- دەبێت کەسی سەرکردە یان مامۆستا یان زانایان خۆیان بە گەورە نەزانن و خۆیان جیانەکەنەوە لە خەڵکەکە و ئەوانیش وەك خەڵکەکە بژین و ئیشیان لەگەڵدا بکەن، چونکە موسڵمانان هەموویان برای یەکترن و مرۆڤەکانیش لەبەر دەم خوای گەورەدا هەموویان یەکسانن مەگەر لە پەرستشدا نەبێت، جا ئەگەر کەسێك خۆی بە گەورە بزانێت ئەوا خوای گەورە ئابڕووی دەبات و سزای دەدات، بەڵکو دەبێت هەموومان وەك پێغەمبەر(ﷺ) بکەین کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا ئیشی دەکرد و چاڵی هەڵدەکەند، هەروەها وەك موسڵمانەکانی تر برسی بوو و نان نەبوو بیخوات مەگەر هەموویان بەیەکەوە.

٥- جولەکە هیچ کات بەڵێنی خۆیان نابەنە سەر و هەموو جارێك ناپاکی دەکەن، سەیرکە جولەکەکانی مەدینە چۆن یەك یەك پەشیمان بوونەوە لەو پەیمانە کە پێشتر بەستبوویان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا، بەڵام خوای گەورە سزای سەختی دان.

٦- دەبێت لە کارەکانماندا بە پێی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بکەین و هەرچی ئەوان ڕێگەمان پێ نەدەن لە خۆمانەوە نەیکەین.

**٧- تۆڵە سەندنەوە کارێکی پێویستە دژ بە دوژمنان، بەڵام ئەگەر موسڵمانێك هەڵەیەکی بچووکی کرد یان تەنانەت بێباوەڕیش بوو، بەڵام کەسێکی دوژمن نەبوو ئەوا دەبێت لێی ببوری، چونکە لێبووردن کارێکە خوا پێی خۆشە.**

# پرسیارەکانی بەشی نۆیەم

١- دوای جەنگی ئوحود بێباوەڕەکان چییان کرد؟

٢- دەتوانیت باسی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە بکەیت کە لە دوای جەنگی ئوحوددا ڕوویدا؟

٣- دایکی سەلەمە کێ بوو؟ چ پەیوەندیەکی هەبوو بە پێغەمبەرەوە؟

٤- حەسەنی کوڕی کوڕی عەلی چی پێغەمبەر(ﷺ) بوو؟ کەی لە دایك بوو؟

٥- بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی حەربی گۆڕی بۆ حەسەن؟

٦- زەید کێ بوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) چ فەرمانێکی پێکرد؟

٧- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) جوولەکەکانی بەنو نەزیری دەرکرد لە مەدینە؟

٨- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەك دوای جەنگی ئوحود بە سەربازەوە چوو بۆ بەدر؟

٩- بەنی موستەلەق کێ بوون؟ بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی لەگەڵدا کردن؟

١٠- ئەو درۆیە چی بوو کە دووڕووەکان هەڵیان بەست بۆ عائیشە؟

١١- جوولەکەکان کە لە مەدینە دەرکران چییان کرد بۆ لەناوبردنی موسڵمانان؟

١٢- جەنگی ئەحزاب لە ساڵی چەندی کۆچیدا ڕوویدا و کێ تیایدا سەرکەوت؟

١٣- پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد تا ناکۆکی بخاتە نێوان بێباوەڕەکان؟

١٤- حوزەیفە کێ بوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) چ فەرمانێکی پێ کرد؟

١٥- خەندەق واتای چیە؟ کێ وتی با خەندەق هەڵبکەنین؟

# بەشی دەیەم
# ڕێككەتننامە و ئازادكردنی مەككە

لە پێش ڕێككەوتننامەی حودەیبییەدا چەند ڕووداوێك ڕوویاندا كە بریتی بوون لە:

١- ژن هێنانی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای جەنگی خەندەق ژنێكی تری هێنا كە ناوی زەینەبی كچی جەحش بوو كە پێشتر ژنی هاوەڵێكی تر بوو، سەرەتا زەینەب لە لایەن زەیدەوە داواكرا لەسەر بنەمای ئیسلامی بوو بە ژنی، بەڵام دوایی ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە و زەید زەینەبی تەڵاق دا و لە یەكتر جیابوونەوە، ئەو كات پێغەمبەر(ﷺ) زەینەبی داوا كرد و هێنای.[1]

پرسیار: تەڵاق واتای چییە؟

وەڵام: تەڵاق واتای جیابوونەوەی ژن و مێردە لە یەكتری و ئەو ژن و مێردە بە یەكەوە ناژین.

كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) زەینەبی هێنا لە ئاهەنگ و شاییەكەیدا چێشتێكی زۆری كردو خەڵكی زۆری دەعوەت كرد تا بێن لەوێ نان بخۆن و ئامادەی ئەو ئاهەنگە بن.[2]

٢- چەند جەنگ و سریەیەك:

پێشتر وتمان سریە واتا ئەو جەنگانەی كە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نەچووە لەگەڵیاندا لە ماوەی نێوان جەنگی ئەحزاب و ڕێككەوتننامەی حودەیبییەدا چەند جەنگ و سریەیەك بەرپابوو بە پێی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) كە بەم جۆرە باسیان دەكەین:[3]

پێغەمبەر(ﷺ) هێزەكانی دەنارد بۆ لێدانی سێ جۆرە هێزی سەرەكی:

---

[1]ـ خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، لاپەڕە(٣٠٤).
[2]ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٣٢).
[3]ـ محمود شاكر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣١٥-٣٢١).

أ- ئەو هێزانەی کە نزیك بوون و لە دەوروبەری ناوچەکەدا بوون و مەترسیان هەبوو بۆ سەر موسڵمانان، ئەو کات پێغەمبەر(ﷺ) هێزی دەنارد تا بچن و ئەو مەترسییە نەهێڵن، بە تایبەت هەندێك لەو هۆزانە هەمیشە دوژمنایەتی سەختیان هەبوو لەگەڵ موسڵمانەکاندا و دەیانویست موسڵمانەکان بکوژن.

ب- ئەو هۆزانەی دوور بوون و پاڵپشتیان هەبوو و دوژمنی موسڵمانان بوون و پلانیان دادەنا تا بە جۆرێك بدەن لە موسڵمانان.

ج- ئەو هۆزانەی یارمەتی بێباوەڕەکانیان دەدا بۆ لێدانی موسڵمانەکان و پارە و سەربازیان دەنارد بۆ بێباوەڕان تا موسڵمانەکانی پێ لەناوبەرن، پێغەمبەر (ﷺ)یش کەوتە لێدان و ترساندنیان و توانی ئەو مەترسیانە نەهێڵێت.

## * ڕێککەوتننامەی حودەیبیە:

کاتێك مەترسی لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی مەدینە نەما و پێغەمبەر(ﷺ) دوژمنەکانی دوورخستەوە لە موسڵمانان، شەوێکیان پێغەمبەر(ﷺ) خەوی بینی کە لە خەویدا چووە بۆ سەردانی ماڵی خوا کە پێی دەوترێت عەمرە.[1]

پرسیار: عەمرە واتای چیە؟

وەڵام: عەمرە بریتیە لە سەردانی ماڵی خوا (کەعبە) لە کاتی جگە لە مانگی جەژنی قورباندا.

پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای ئەو خەوە بڕیاریدا لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانیدا بچێت بۆ مەککە و بۆ سەردانی ماڵی خوا و بەجێهێنانی عەمرە، بۆ ئەمەش موسڵمانانی ئاگادارکردەوە و پێی فەرموون خۆتان ئامادەبکەن تا بچن لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ژمارەی موسڵمانان (١٥٠٠) هەزار و پێنج سەد کەس بوون کە دایکی سەلەمەی خێزانی

[1] - عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، لاپەرە (٣٤١).

پێغەمبەر(ﷺ)یش لەو عەمرەیەدا بەشدار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) عبدالله کوڕی ئوم مەکتومی دانا تا کاروباری مەدینە ببات بەڕێوە، هەروەها چەند کەسێکی نارد بۆ مەککە تا هەواڵی بێباوەڕەکان وەربگرن، پاشان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان کەوتنەڕێ و چەکیان نەبرد جگە لە شمشێر،[١] لە ڕێگەدا کۆمەڵێك لە بێباوەڕەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێیان وت بۆچی کەوتوونەتەڕێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێمە بۆ جەنگ نەهاتووین بەڵکو تەنها دەمانەوێت سەردانی ماڵی خوا بکەین،[٢] ئەوانیش چوونەوە و هەواڵەکەیان بردەوە بۆ بێباوەڕەکانی مەککە، بەڵام بێباوەڕەکان باوەڕیان پێ نەکردن و وتیان ئێوە دەتانەوێت فێڵ بکەن لە ئێمە و یارمەتی موسڵمانەکان بدەن،[٣] بێباوەڕەکان هەر پێشتر کە بیستبوویان موسڵمانان دێن، هێزیان ئامادەکردبوو بۆ لێدانی موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەیویست جەنگیان لەگەڵ بکات و ڕێگەی گۆڕی بۆ شوێنێکی تر و فەرمووی: قوڕ بەسەری قورەیشدا بۆ ئەوەی حەزیان لە جەنگە، چی دەبێت ئێمە بچین بۆ سەردانی ماڵی خوای گەورە و جەنگ نەکەین و بگەڕێینەوە.[٤]

پاشان دوای ئەو هەوڵەی موسڵمانان بێباوەڕان چەند وەفدێکی تریان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بزانن بۆچی هاتوون، لەگەڵ ئەوەشدا بە نهێنی هەندێ سەربازیان نارد تا بدەن لە موسڵمانەکان، بەڵام چەند هاوەڵێکی بەڕێز هەستان بە لێدانیان و دەریان کردن، بەمە موسڵمانان هێزی خۆیان نیشان دایەوە.[٥]

دوایی پێغەمبەر(ﷺ) عوسمانی کوڕی عەفانی نارد بۆ لای بێباوەڕەکان تا لەوێ قسەیان لەگەڵ بکات و پێکەوە ڕێك بکەون، بەڵام هەواڵ بەو جۆرە بڵاوبوویەوە کە بێباوەڕەکان عوسمانی کوڕی عەففانیان شەهید کردووە.[٦]

---

[١]- ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٥٤).
[٢]- عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٢٤٣-٢٤٤).
[٣]- ابن الاثیر: الکامل في التأریخ، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٨٣).
[٤]- ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٨٦).
[٥]- ابن هشام: السیرة النبویة، لاپەڕە (٨٥٧).
[٦]- د. حسن ابراهیم حسن: تأریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٠٦).

پرسیار: عوسمانی کوڕی عەففان کێ بوو؟

وەڵام: عوسمانی کوڕی عەفان هاوەڵێکی بەڕێز و دەوڵەمەندی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە زۆر پارەی خەرج دەکرد لە پێناو ئیسلامدا و پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێدابوو.[١]

پرسیار: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بیستی عوسمانیان شەهید کردووە چی کرد؟

وەڵام: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەواڵەی بیست تەواو تووڕە بوو و ویستی جەنگ بکات لەگەڵ بێباوەڕەکاندا و تۆڵەی عوسمان بسێنێتەوە، بۆ ئەمە هەموویان لە ژێر درەختێکدا کۆبوونەوە و هەموویان دەستیان خستە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) و بەڵێنیان دا جەنگ بکەن لەگەڵ بێباوەڕاندا و تۆڵەی خوێنی عوسمان بسێننەوە.[٢]

کاتێك بێباوەڕان ئەم هەواڵەیان بسیت تەواو ترسان و بە پەلە وەفدێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و پێی بڵێن کە ئەوان عوسمانیان نەکوشتووە و عوسمان زیندووە، هەروەها بۆ ئەوەی ڕێك بکەون لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ).[٣]

کاتێك بێباوەڕان هاتن تا ڕێککەوتن بکەن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا چوونە ناو چادرەکەی پێغەمبەر(ﷺ)و هەندێ لە هاوەڵان لەوێ بوون، ئیمامی عەلی لەسەر وەرەق دەقی نووسینەکەی دەنووسیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بنووسە بسم الله الرحمن الرحيم، بەڵام بێباوەڕەکان وتیان دەبێت تەنها بنووسی بسم الله، پاشان فەرمووی بنووسە ڕێککەوتنی محمدی پێغەمبەری خوا، ئەوان وتیان نابێت بنووسی پێغەمبەری خوا چونکە ئێمە باوەڕمان نیە، عەلی حەزی نەکرد بەگوێیان بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە گوێی کردن.[٤]

دوایی دەقی ڕێککەوتننامەکە نوسرا کە بریتی بوو لەم خاڵە گرنگانە:

١- دەبێت بۆ ماوەی دە ساڵ جەنگ لە نێوان هەردوو لادا بوەستێنرێت.

---

[١]- د. حامد احمد الطاهر: حياة الصحابة للاطفال، لاپەڕە (٥٩-٨١).

[٢]- محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٣٢٦).

[٣]- ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٤٦١).

[٤]- ابن كثير: البداية والنهاية، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٩٠).

٢- هەر كەس لە بێباوەڕەكان موسڵمان ببێت دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) بیگێڕێتەوە.

٣- هەر موسڵمانێك ببێتە بێباوەڕ ئەوا موسڵمانەكان نایگێڕنەوە.

٤- لە نێوان هیچ كامیاندا ناپاكی و دوژمنایەتی و دز و بڕی ڕوونەدات.

٥- هەردوولا دەتوانن هاوپەیمانی ببەستن لەگەڵ هۆزەكانی تردا.

٦- موسڵمانان ئەو ساڵە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە و سەردانی ماڵی خوای گەورە نەكەن، بەڵام بۆ ساڵی داهاتوو پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان بۆیان هەیە بە بێ چەك و بە ئارامیشەوە سەردانی ماڵی خوای گەورە بكەن.[1]

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بێباوەڕەكانی بەڕێ كرد و فەرمانی كرد بە موسڵمانەكان تا قوربانیەكانیان بكەن بۆ خوای گەورە سەری خۆیان بتاشن.[2]

پرسیار: هەڵوێستی موسڵمانان چی بوو لەو بارودۆخەدا؟

وەڵام: موسڵمانان زۆر لەو هەڵوێستە ناڕازی بوون و وایان زانی سەركەوتن بۆ بێباوەڕەكان بووە و موسڵمانان شكستیان هێناوە، بەڵام خۆی وا نەبوو.

پێغەمبەر(ﷺ) سەیری كرد موسڵمانان بە گوێی ناكەن و خەفەتبارن فەرمووی بە خێزانەكەی ئەوانە نەگبەتیان هاتووە و بە گوێم ناكەن، خێزانەكەشی بە ژیرانە وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە خەفەتبارن جا تۆ خۆت دەست پێ بكە كاتێك ئەوان تۆیان بینی وەك تۆ دەكەن و بە گوێت دەكەن.

پێغەمبەریش(ﷺ) بە گوێی كرد و چوو لەبەر چاوی موسڵمانەكان دەستی پێكرد، موسڵمانەكانیش كە پێغەمبەر(ﷺ)یان بینی بە گوێیان كرد و دەستیان پێ كرد.[3]

---

[1] د. حسن ابراهیم حسن: تاریخ الاسلام، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (١٠٦-١٠٧).
[2] عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٢٥٤).
[3] د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٨٠).

دوایی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانەکان گەڕانەوە بەرەو مەدینە و جەنگ ڕووی نەدا، کاتێك چوونەوە بۆ مەدینە خوای گەورە ئایەتی پیرۆزی قورئانی دابەزاند کە ئێوە سەرکەوتوون و موسڵمانان با حەز نەکەن بەڵام خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) باشتر دەزانن، کاتێك موسڵمانانیش ئەمەیان بیست بێدەنگ بوون و دڵیان خۆش بوو و وتیان بە دڵنیاییەوە ئەمە سوودێکی باشی تێدا دەبێت.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- پێویستە ئەگەر بتوانین لەکاتی ئاهەنگدا چێشت بگێڕین، نابێت تەنها کەسی دەوڵەمەند بانگ بکەین، چونکە ئەوە تاوانە و خوای گەورە پێی ناخۆشە، بەڵکو دەبێت هەژار و فەقیرەکانیش بانگ بکەین و دەوڵەمەندەکانیش بانگ بکەین.

٢- موسڵمان دەبێت لە جەنگ نەترسێت و هەر جەنگێك لە پێناو ئاییندا بێت ئامادەبێت بڕوات و دڵنیا بێت خوای گەورە ئاگای لێیەتی و یان سەردەکەوێت یان شەهیدی و بەهەشتە، دەی منداڵی موسڵمان ئەگەر دڵنیا بین باوك یان برا یان کەسمان یان خۆمان لەڕێگەی خوادا جەنگ بکەن یان سەردەکەون یان شەهید دەبن و دەچنە بەهەشت، ئیتر بۆچی خەفەت بخۆین و بترسین بەڵکو دەبێت خۆشیمان بێت و دوعایان بۆ بکەین.

٣- خەو شتێکی گرنگە و ئەگەر یەکێکمان خەوێکی خۆشی بینی با بیگێڕێتەوە بۆ مامۆستایەکی زیرەك یان کەسێکی شارەزا تا بزانێت واتای ئەو خەوە خۆشە چیە؟

٤- سەردانی ماڵی خوا کارێکی پیرۆزە و خێر و چاکەیەکی زۆر زۆری هەیە کە موسڵمان ناتوانێت خێرەکەی بزانێت مەگەر بەس خودا خۆی، هەروەها خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی ئەو کەسە خۆش دەبێت و وەك ئەو وایە هیچ گوناهی نەکردبێت، دەبێت هەموو جارێك دوعا بکەین تا بتوانین سەردانی ماڵی پیرۆزی خوای گەورە بکەین.

---

[1]. ابن اسحاق: السیرة النبویة، لاپەڕە (٤٦٤).

٥- دەبێت ئێمە و موسڵمانان لە پێش موسڵمانەکانی ترەوە بچین بۆ ماڵی خوا یان بۆ هەر ئیشێکی تری خێر، نەوەك بە موسڵمانان بڵێین ئێوە بڕۆن، کەچی خۆمان نەڕۆین و دابنیشین، بەڵکو وەك پێغەمبەر(ﷺ) بچین لەگەڵیاندا.

٦- دەبێت تا دەکرێت خۆمان لە جەنگ و ئاژاوە بپارێزین و خۆمان دوور بخەینەوە وەك چۆن کە پێغەمبەر(ﷺ) کە زانی بێباوەڕەکان دێن بۆ جەنگ رێگەکەی گۆڕی تا جەنگ نەکەن، بەڵام ئەگەر هەر جەنگ هاتە رێت دەبێت پیاوانە جەنگ بکەیت.

٧- نابێت موسڵمان بهێڵێت تۆڵەی موسڵمان بفەوتێت و دەبێت رێگە نەدات بە بێباوەڕان تا ستەم بکەن لە موسڵمانان، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدەین تۆڵەی موسڵمانان بسێنینەوە.

٨- هەر شتێك فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەبێت زۆر بەپەلە گوێڕایەڵی بین و ڕقمان نەبێت، چونکە خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) لە ئێمە باشتر دەزانن.

## ئەنجامی رێککەتننامەکە:

لەو ئەنجامەدا کە هەر دوولا گەڕانەوە، جێبەجێکردنی بڕیارەکە دەستی پێکرد.

ئەوەبوو چەند جارێك هەندێك لە بێباوەڕان موسڵمان دەبوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەیگێڕانەوە بۆیان ئەوانیش دەکەوتنە ئازاردانی ئەو موسڵمانانە.

جارێکیان کە ئافرەتێك موسڵمان بووبوو هاتبوو بۆ مەدینە، بێباوەڕەکان هاتن بە شوێنیدا، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بیگەڕێنێتەوە، بەڵام ئافرەتەکە وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتم ئەگەر بچمەوە سووکایەتیم پێ دەکەن و ئابڕووم دەبەن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئافرەتەی نەگێڕایەوە و ئەوانیش چوونەوە بۆ مەککە.[1]

[1]- ابن الاثیر: الکامل في التاریخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٨٦).

جارێکی تر کەسێکی تر لە بێباوەڕان موسڵمان بوو کە ناوی (ابو بصیر) بوو، بێباوەڕان هاتن بە شوێنیدا، پێغەمبەر(ﷺ) دایەوە پێیان و فەرمووی بەڵکو خوای گەورە ڕەحمەت پێ بکات.

لە ڕێگەدا ئەبو بەصیر لەگەڵ دوو بێباوەڕەکەدا بوو، توانی بە پەلە خۆی ڕزگار بکات لێیان و ڕایکرد و چوو بۆ ناوچەیەکی جیاواز لەوێ بە موسڵمانی بۆ خۆی دانیشت، ئەو کات هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی خۆ ئێستا تۆ پەیمانەکەت هەڵنەوەشاندۆتەوە، من خۆم جەنگم لەگەڵدا کردوون ڕامکردووە بۆ ئەم ناوچەیە.[1]

دوایی یەك بە یەك بێباوەڕەکانی ناو مەککە موسڵمان دەبوون و ڕایان دەکرد بۆ لای ئەبو بەصیر و لەوێ ژمارەیان زیادی کرد و تەواو بەهێز بوون، ئەو موسڵمانانە هێرشیان دەکردە سەر کاروانە بازرگانیەکانی بێباوەڕەکان و زیانیان پێ دەگەیاندن و سەرکەوتن بە سەریاندا، ئەمەش تەواو بێباوەڕەکانی بێزار کردبوو و نەیان دەزانی چی بکەن تا ئەوەی لە کۆتاییدا بڕیاریاندا بچن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوا بکەن ڕێککەوتننامەکە هەڵوەشێننەوە.

پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو ڕێککەوتنەکەیان لابرد، دوایی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد بۆ ئەبو بەصیر و موسڵمانەکانی تر تا بگەڕێنەوە بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانەکان، ئەوانیش گەڕانەوە بەڵام ئەبو بەصیر کاتێك نامەکەی پێ گەیشت لە سەرەمەرگدا بوو و مرد، خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش بێت و بیخاتە بەهەشتی بەرین.[2]

---

[1]. عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەرە (٣٥٣-٣٥٤).
[2]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەرە (٣٦٤).

## جەنگی خەیبەر:

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێککەوتننامەی حودەیبیە گەڕایەوە بڕیاریدا جەنگ بکات لەگەڵ ئەو جوولەکانەی کە دژ بە موسڵمانەکان خەڵکیان کۆدەکردەوە و خۆیان و خەڵکی تر کەوتنە هێرش کردنەسەر موسڵمانەکان، بۆ ئەمە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا ئەو موسڵمانانە لەو جەنگەدا بەشداری بکەن کە لە ڕێککەوتننامەی حودەیبیە چووبوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا، سەرکردەی بێباوەڕەکان هەواڵی دا بە جوولەکەکانی خەیبەر کە با ئاگایان لە خۆیان بێت چونکە موسڵمانەکان هێرشیان دەکەنەسەر، جوولەکەکانی مەدینەیش زۆر خەفەتیان خوارد بەوە و هەر کامێکیان قەرزی لای موسڵمانێك بوایە داوای قەرزەکەی خۆی دەکرد تا موسڵمانەکان پارەیان نەبێت بچن بۆ ئەو جەنگە، ژمارەی سەربازە موسڵمانەکان (١٥٠٠) هەزار و پێنج سەد موسڵمان بوو کە بەڕێکەوتن بەرەو خەیبەر،[١] جوولەکەکانی خەیبەریش کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ بەرگری کردن لەو هێرشە و داوای یارمەتیان کرد لە چواردەوریان، ئەو کات لەم لا و لەو لاوە یارمەتیان بۆ دەهات تا ژمارەی ئەوان بوو بە یانزە هەزار کەس،[٢] موسڵمانەکان کەوتنە گەمارۆدانی ناوچەکە و چەند جارێك هێرشیان کرد، بەڵام سەرنەکەوتن و وازیان نەهێنا تا لە هێرشەکەیاندا سەرکەوتن و توانیان بەربەستەکانی بەردەمیان نەهێڵن و بەرەو پێشەوە بچن، کاتێك جوولەکەکان ئەمەیان بینی، داوایان لە موسڵمانەکان کرد تا ڕێککەوتن بکەن، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێککەوت لەگەڵیاندا لەسەر ئەوەی ئەو جوولەکانە ساڵانە نیوەی بەروبوومی خۆیان بدەن بە موسڵمانان، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) کەی بیەوێت دەتوانێت لەو ناوچەیەدا دەریان بکات.[٣] پاشان پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی برد بەرەو ئەو ناوچانەی کە یارمەتی جوولەکەکانیان دابوو و ناچاری کردن داوای ڕێککەوتن بکەن، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێککەوت لەگەڵیاندا کە نیوەی بەرهەمی ساڵانەیان بدەن بە موسڵمانەکان.[٤]

---

[١]- د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٦٩٦-٦٩٩).

[٢]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٣٥).

[٣]- د. حسن ابراهیم حسن: تأریخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١١٣).

[٤]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٣٨-٣٤١).

## * سەردانی ماڵی خوا:

لە دوای ڕێککەوتننامەی حودەیبییەدا بە پێی ڕێککەوتنەکە موسڵمانەکان هاتن بۆ سەردانی ماڵی خوا و ژمارەیان دوو هەزار کەس بوو، هەروەها دووسەد ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو لەگەڵ چەکدا، بێباوەڕەکان وتیان ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆ دەتەوێت فێڵ بکەیت لە ئێمە؟ بۆچی چەکت هێناوە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی نایهێنین لەگەڵ خۆماندا.

کاتێك موسڵمانەکان چوونە ناو مەککەوە بێباوەڕەکان زۆر خەفەتیان دەخوارد بەوە، بۆیە چوون بۆ ناوچە شاخاویەکان و ناو شاریان بەجێهێشت بۆ ئەوەی موسڵمانەکان سەردانەکەی خۆیان بکەن و ئەمان نەیان بینن.

پێغەمبەر(ﷺ) دووسەد کەسی دانا لە لای چەکەکان بۆ ئەوەی نەهێڵن کەس فێڵ بکات لە موسڵمانان، ئینجا موسڵمانەکان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا سەردانی ماڵی خوایان تەواو کرد و گەڕانەوە و چەکەکانیان هەڵگرت و چوونەوە بەرەو مەدینە بێباوەڕەکانیش بە خەفەتباریەوە گەڕانەوە بۆ ناو مەککە.[1]

### * بانگکردنی پاشا و سەرکردەکان بۆ ئیسلام:

پێغەمبەر(ﷺ)نامەی نارد بۆ کۆمەڵێك پاشا و سەرکردە و داوای لێ کردن موسڵمان بن و خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئیسلام چونکە ئەگەر موسڵمان بن چیان هەیە بۆ خۆیان دەبێت و وەك خۆیان دەمێننەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نارد بۆ ئەمانە:

١- پاشای ڕۆم.

٢- پاشای فارس.

٣- پاشای بەحرەین.

---

[1] ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٢٥٥-٢٦١).

٤- پاشای حەبەشە.

٥- فەرمانڕەوای میسر.

٦- ناوچەی یەمامە.

٧- غەساسینە.

٨- هەردوو پاشاکەی عومان.

٩- پاشای یەمەن.

کاتێك نامەکانیان پێ گەیشت جگە لە سیانیان:

١- پاشای ڕۆم کە ڕێزی نامەکەی گرت و دیاری نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام موسڵمان نەبوو.

٢- غەساسینە موسڵمان نەبوو و هەڕەشەی کرد.

٣- پاشای فارس نامەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی دڕاند.[1]

[1]. محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٣٥٠-٣٥١-٣٥٢).

## * موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص:

عەمر کەسێکی بێباوەڕ و خراپ بوو لە هەرسێ جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەقدا بەشداری کرد بە موسڵمانان، بەڵام تیایدا نەکوژرا و ڕزگاری بوو.

عەمر دەڵێت کاتێك بیستم موسڵمانان دێن بۆ سەردانی ماڵی خوا، وتم من ئەمەم لا عەیبە و ئەم وڵاتە بەجێ دێڵم، چەند کەسێکی تریش وەك منیان وت و پێیان وتم تۆ چی بڵێیت ئێمە بە گوێت دەکەین، منیش وتم با بچین بۆ لای پاشای حەبەشە و کۆمەڵێك دیاری بۆ ببەین و لەوێ بین ئەوەك بکەوینە ژێر دەستی محمد و موسڵمانان، دوایی دیاریمان بۆ کۆکردەوە و کەوتینەڕێ، کاتێك گەیشتینە ئەوێ دەبینم نوێنەری موسڵمانان گەیشتۆتە لای نەجاشی و داوای لێ کرد موسڵمان ببێت، ئەویش موسڵمان بوو، منیش چوومە پێشەوە و کڕنووشم بۆ برد و ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی دیاریت بۆ هێناوم؟ وتم: بەڵێ دیاریەکانم پێدا و ئەویش دڵخۆش بوو پێی.

پاشان وتم گەورەم ئەم نوێنەری موسڵمانانە دوژمنی ئێمەیە و بەدەرێ با بیکوژم، یەکسەر ئەو تووڕە بوو و زللەیەکی لێدام و لووتم پڕ بوو لە خوێن، وتم دەی باشە مەمدەرێ، نەجاشی وتی ئەی عەمر چۆن نوێنەری موسڵمانان دەدەم بە تۆ، باوەڕی پێ بهێنە و منیش باوەڕم هێنا بە ئیسلام و نەجاشی لووتی شۆردم، ئینجا چووم هاوڕێکانی خۆمم بەجێهێشت و وشترێکم کڕی و چووم بەرەو مەدینە، لە ڕێگەدا گەیشتم بە خالید و عوسمانی کوڕی تەلحە و بە یەکەوە چووین و موسڵمان بووین.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- موسڵمان کاتێك بەڵێنێکی دا بە کەسێك یان لەگەڵیدا ڕێککەوت دەبێت پەیمانەکەی خۆی بباتەسەر و لە بەڵێنی خۆی لانەدا، سەیرکەن پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بێباوەڕەکاندا ڕێککەوتنی بەستبوو، بەڵام ڕێککەوتنەکەی بردەسەر و نەیشکاند تا بێباوەڕەکان خۆیان داوایان کرد و ڕێککەوتنەکەیان شکاند.

---

[1] ـ هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ): خالد محمد خالد، لاپەڕە (٧٢٤).

٢- ئازایەتی و پاڵەوانی ئەبو بەصیر بەڵگەیە بۆ موسڵمان کە خۆی ڕزگار بکات لە دەستی بێباوەڕ و ستەمکار و چاوەڕوان نەکات تا ئەوان چییان دەوێت بیکەن.

٣- هەر کەسێك دژایەتیمان بکات و زیانمان پێ بگەیەنێت و واز نەهێنین.

٤- سەردانی ماڵی خوا کارێکی پیرۆزە و هەمیشە دەبێت لە بیرمان بێت، ئەوەك ئەگەر جارێك ڕێك نەکەوت بۆمان واز بهێنین، بەڵکو دەبێت هەمیشە هەوڵ بدەین.

٥- دەبێت موسڵمان قسەی باش و ڕێگەی جوان فێری هەموو کەس بکات و نەڵێت ئەمە گەورەیە و ئەمە بچووکە، سەیرکەن پێغەمبەر(ﷺ) کە دەسەڵاتیشی زۆر گەورە نەبوو کەچی سەرکردە و پاشاکانی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام.

## * جەنگی مۆئتە:

لەو کاتەدا دەسەڵاتێکی بەهێز هەبوو، کە ناسرابوو بە دەسەڵاتی ڕۆمەکان، ئەو ڕۆمانە ئاینی مەسیحیان هەبوو، ئەوان هەندێ عەرەبیان بە کرێ گرتبوو تا ڕێگە بگرن لە هێرشی هێزە عەرەبە خێڵەکیەکانی ئەو دەوروبەرە.

ڕۆم دەیویست ئەو هۆزانە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان و ڕێگە نەدەن موسڵمانان لەو ناوچەیەدا ئاینی ئیسلام بڵاوبکەنەوە و چواردە زانا و گەورەی ئیسلامیان شەهید کردن، بۆ ئەمە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا تۆڵەی ئەو موسڵمانانە بسێنێتەوە، بۆ ئەمەش سێ هەزار سەربازی ئامادەکرد کە سێ سەرکردەی دانا و فەرمووی کاتێك سەرکردەی یەکەم شەهید بوو با دووەمیان ببێ بە سەرکردە دوایی ئەوی تریان بەو جۆرە.

کاتێك عەرەبەکان ئەم هەواڵەیان بیست(٥٠) سەربازیان نارد تا هەواڵ وەربگرن، بەڵام موسڵمانەکان هەموویان گرتن و کوشتنیان.

عەبەرەکان تەواو ترسان و داوای یارمەتیان کرد لە ڕۆمەکان، بەمە ژمارەی سەربازەکانیان گەیشتە(٢٠٠) هەزار سەرباز.[١]

موسڵمانەکان و بێباوەڕەکان کەوتنە جەنگ کردن و موسڵمانەکان زۆر دلێرانە جەنگیان کرد، تا حەوت ڕۆژی ڕێك جەنگ بەردەوام بوو، لە ڕۆژی شەشەمدا سەرکردەی موسڵمانی یەکەم شەهید کرا و مامی پێغەمبەر(ﷺ) جەعفەر بوو بە سەرکردە و ئەویش شەهید بوو، دوایی یەك یەك سەرکردە دەگۆڕێت تا هەموویان سەرکردایەتیان دایە دەستی خالید جەنگ کرا تا شەو هات و جەنگەکە وەستێنرا، ئینجا خالید فێڵێکی کرد کە سەربازە ڕۆمیەکانی ترساند و توانی بە سەرکەوتووی و بە لێزانیەوە سەربازە موسڵمانەکان بگێڕێتەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەمە دڵخۆش بوو.[٢]

## * جەنگی ذاتوسەلاسل:

کاتێك ڕۆمەکان مەترسی موسڵمانەکانیان بۆ دەرکەوت ڕۆم بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان و بە یەکجارەکی لەناویان بەرن، بۆ ئەمەش هۆزە عەرەبەکانیان هاندا و چەك و سەربازیان پێدان تا هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە پەلە هێرشی کردنە سەر لە ڕێگەی نزیکەی (٥٠٠٠) موسڵمانەوە و لە کۆتاییدا توانیان دوژمنان ڕاوەدوو بنێن و مەترسیان نەهێڵن و بە سەرکەوتوویی بگەڕێنەوە.[٣]

---

[١]. ابن الاثیر: الکامل في التأریخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە (١١١-١١٢).
[٢]. د. محمد عبدالقادر ابو فارس، الصراع مع الصلیبیین، لاپەڕە (٥٦-٦٢).
[٣]ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٧٤٤-٧٤٨).

## * ڕزگارکردنی مەککە:

کاتێك هاوپەیمانی بەسترا لە نێوان و موسڵمانان و هۆزەکاندا کەوتنە یارمەتیدانی هۆزەکانیان دژ بە هاوپەیمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاوپەیمانەکانیش چوون بۆ داوای یارمەتی لە پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ)یش بڕیاریدا یارمەتیان بدات، بێباوەڕەکان نوێنەریان نارد تا داوا بکەن لە پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتیان نەدات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی نەدانەوە و بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر مەککە و ئازادی بکات.

پێغەمبەر(ﷺ) سەربازێکی زۆرزۆری موسڵمانەکانی کۆکردەوە و کەوتنەڕێ بەرەو مەککە، کاتێك بێباوەڕەکان ئەمەیان بیست بە تەواوی ترسان و نەیان دەزانی چی بکەن، پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان گەمارۆی مەککەیان دا و دوای قسەکردن لەگەڵ بێباوەڕەکاندا بڕیار درا موسڵمانەکان بەبێ جەنگ بچنە مەککەوە، چونکە بێباوەڕەکان نەیان دەتوانی بەرگری بکەن دژ بە موسڵمانەکان.[1]

کاتێك موسڵمانەکان چوونە مەککەوە لە هەر چوار لاوە چوونە ژوورەوە و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا خەڵکەکە نەکوژێت و تۆڵەی موسڵمانان نەسێنێتەوە، بەڵام هەندێ کەسی زۆر پیس و خراپ هەبوو بڕیاریدا بیان کوژێت ئەگەریش بڵێن موسڵمان بووین.[2]

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ڕووخاندنی وە شکاندنی بتەکانی نێو کەعبە و کەعبە پاك کرایەوە و بیلال بانگی تیادادا، بەمە موسڵمانان مەککەیان ڕزگار کرد.[3]

---

[1] ابن خیاط: تاریخ خليفة ابن خياط، لاپەڕە (٤١).

[2] عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لاپەڕە (٣٩٧).

[3] عبدالعزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر، لاپەڕە (٣٠٧).

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- بێباوەڕان هەوڵ دەدەن بە هەر جۆرێك بێت موسڵمانان لەناو بەرن، لەگەڵ ئەوەشدا مەسیحی و جوولەکەیش وەك ئەوان دەیانەوێت ئاینی ئیسلام لەناو بەرن، بۆ ئەمەش هەموویان یارمەتی یەکتر دەدەن پێکەوە هێرش دەکەن.

٢- نابێت بە شەهید بوونی هاورێ یان موسڵمانێك یان سەرکردەیەك ئێمە سارد ببینەوە، بەڵکو دەبێت بەردەوام بین و گوێمان نەبێت لە شەهیدی لە کاتی جەنگدا.

٣- پێش ئەوەی دوژمن بیەوێت هێرش بکاتە سەرمان دەبێت ئێمە بەرپەرچی بدەینەوە.

٤- ئەگەر هاوپەیمانیمان بەست لەگەڵ کەسێکدا دەبێت هاوپەیمانی حەق بکەین.

٥- دەبێت لێبووردەییمان هەبێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لێبووردەیی هەبوو.

# پرسیارەکانی بەشی دەیەم

١- ئەو ڕووداوانە بژمێرە کە لە پێش ڕێککەوتننامەی حودەیبیەدا ڕوویاندا؟

٢- عەمرە واتای چیە؟ بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا عەمرە بکات؟

٣- کاتێك بێباوەڕان بیستیان موسڵمانان دێن بۆ عەمرە چیان کرد؟

٤- پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگەدا چی کرد بۆ ئەوەی تووشی جەنگ نەبێت؟

٥- بێباوەڕەکان چییان کرد بۆ لەناوبردنی موسڵمانەکان لە ڕێگەی عەمرەدا؟

٦- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)بیستی کە بێباوەڕەکان عوسمانیان شەهید کردووە چی کرد؟

٧- بێباوەڕەکان چیان کرد بە عوسمان؟ ئەی وەڵامیان چی بوو بۆ موسڵمانەکان؟

٨- ئەو هاوەڵە کێ بوو کە دەقی ڕێککەوتننامەکەی دەنووسیەوە؟

٩- خاڵەکانی ڕێککەوتننامەی حودەیبیە بژمێرە.

١٠- موسڵمانەکان هەڵسوکەوتیان چۆن بوو بەرامبەر بەو ڕێککەوتننامەیە؟

١١- پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد بۆ ئەوەی موسڵمانەکان بەگوێی بکەن؟

١٢- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ئافرەتە موسڵمانەکەی نەگێڕایەوە؟

١٣- ئەبو بەصیر کێ بوو؟ ئەی چی کرد؟

١٤- بێباوەڕەکان بۆچی ڕێککەوتننامەکەیان هەڵوەشاندەوە؟ بۆچی هەڵیان وەشاندەوە؟

١٥- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی کردە سەر خەیبەر؟

١٦- ئەنجامی جەنگی خەیبەر چی بوو؟

١٧- عەمری کوڕی عاص کێ بوو؟ بۆچی نەجاشی زللەیەکی لێدا؟

١٨- بۆچی جەنگی موئتە ڕوویدا؟ کێ لە جەنگەکەدا سەرکەوت؟

١٩- پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا لە ئازادکردنی شاری مەککەدا چۆن بێت لەگەڵ خەڵکدا؟

# بەشی یانزەهەم

## لە دوای ئازادکردنی مەککە تا کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)

### جەنگی حونەین:

کاتێك موسڵمانان توانیان مەککە ئازاد بکەن هەندێ لە هۆزەکانی دەوروبەر تەواو ترسان و بڕیاریاندا پێش ئەوەی موسڵمانان هێرش بکەنەسەر ئەوان، بکەونە هێرش کردنە سەر موسڵمانان و لەناویان بەرن، ئەوان وتیان ئەگەر بکوژرێین باشترە لەوەی کە بچینە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان، ئەو دوو هۆزەش بریتی بوون لە هۆزی هەوەزان و سەقیف (ثقیف) کە خۆیان کۆکردەوە تا هەرچۆنیان کردووە شکست بهێنن بە موسڵمانان،[1] پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەوانی زانی و بڕیاری هێرشی دا و موسڵمانێکی زۆری کۆکردەوە کە دوانزە هەزار موجاهید بوون.[2]

موسڵمانەکان کاتێك ژمارەی زۆری خۆیان بینی تەواو سەرسامی خۆیان بوون و وتیان ژمارەمان زۆرە و بە دڵنیاییەوە سەردەکەوین،[3] ئیتر بیریان چووبوو کە سەرکەوتن بە ژمارەی زۆر و کەم نیە، کاتێك جەنگی نێوان موسڵمانان و ئەو هۆزە بێباوەڕانە دەستی پێ کرد، موسڵمانان بەرەنگاری هێزی بێباوەڕەکان بوونەوە و نەیان توانی سەرکەون بەسەریاندا، بێباوەڕەکانیش دڵیان خۆش بوو وایان زانی سەرکەوتن بەسەر موسڵمانەکاندا.[4]

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەموو موسڵمانەکانی کۆکردەوە و نەیهێشت ڕابکەن و پێی ڕاگەیاندن کە لە خۆیان بایی نەبن و جیهاد بکەن، خوای گەورەش فریشتەی لە ئاسمانەوە نارد بۆ لای موسڵمانان تا یارمەتیان بدەن،[5] بەمە موسڵمانەکان جارێکی تر توانیان سەرکەون بە سەریاندا، پێغەمبەر(ﷺ) دەسکەوتەکانی جەنگی کۆکردەوە کە پێیان دەوترێت (الغنائم)و

---

[1] ـ د. حسن ابراهیم حسن: تأريخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١١٦).
[2] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٧٨٠).
[3] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٧٦).
[4] ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٦٢-٣٧٢).
[5] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٧٧).

دابەشی کرد بەسەر موسڵمانەکاندا، هەندێ لە بێباوەڕەکان خۆیان کۆکربوویەوە لە چەند شوێنێکدا بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هێزی بۆ ناردن و لێیان دان و سەرکەوتن بەسەریاندا.[١]

## هێرشکردنی بۆ تائیف:

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاردیدا هێرش بکاتە سەر تائیف و ڕزگاری بکات لە دەستی بێباوەڕان، بۆ ئەوەی ئاینی ئیسلام بڵاوبکاتەوە لەو ناوچەیەدا.

بۆیە داوای کرد لە موسڵمانەکان تا خۆیان ئامادە بکەن، موسڵمانە پشتیوان و کۆچەرەکان و ئەوانەی مەککەیش کۆبوونەوە تا بچن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا و هەموو بە یەکەوە کەوتنەڕێ و توانیان بە ئاسانی سەرکەون بەسەر بێباوەڕەکانداو تائیف ڕزگار بکەن، لە ئازادکرنی تائیفدا جەنگ ڕووی نەدا کە کوشتنی تێدابێت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) پاش ئەوەی کە گەمارۆی دابوون گەڕایەوە و نزای خێری بۆ کردن تا خوای گەورە ڕێنموونیان بکات بۆ ئیسلام،[٢] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان گەڕانەوە بۆ بیحرانە و لەوێ دەسکەوت کۆکرایەوە و پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی دایە کۆچەران و ئەوانەی مەککە، کاتێك پشتیوانەکانی مەدینە ئەمەیان بینی وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئێمە چیمان بەر دەکەوێت؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دەسکەوتتان دەوێت بتان دەمێ یان خۆم لەگەڵتادا بگەڕێمەوە و لەگەڵتاندا بم، سوێند بە خوا ئەگەر پشتیوانان بچن بە شێوێکدا و ئەوانی تریش بچن بە شێوێکی تردا من لەگەڵ پشتیواناندا دەبم، بەمە پشتیوانەکان ڕازی بوون و وازیان هێنا،[٣] لەوێوە پێغەمبەر (ﷺ) چوویەوە بۆ مەککە بۆ مەراسیمی عەمرەی پیرۆز و لەوێوە گەڕایەوە بەرەو شاری پیرۆزی مەدینە و سەرکردەیەکی لە شاری مەککە دانا و هاوەڵێکیشی دانا تا خەڵکی مەککە فێری ئیسلام بکات.[٤]

---

[١]- عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، (٤٠٩).
[٢]- ابن خیاط: تأریخ خلیفة ابن خیاط، لاپەڕە (٤٢).
[٣]- محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٨٠).
[٤]- ابن الاثیر: الکامل فی التأریخ، بەرگی دووەم، لاپەڕە (١٤١).

پرسیار: ئەو هاوەڵە ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو هاوەڵە ناوی مەعازی کوڕی جەبەل بوو.

پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە مەدینە و چەند کۆمەڵێکی موجاهیدی نارد بۆ لێدانی ئەوانەی دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانن، پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی نارد تا بچن بۆ شکاندنی بتێك کە پێی دەوترا (فلس)، ئەویش لەگەڵ پەنجا سواردا چوو لێیدان و سەرکەوت بەسەریاندا و بتەکەی شکاند و دەسکەوتی کۆکردەوە و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەندێ لە ئافرەتانی ئەوێی بە دیل هێنایەوە بۆ مەدینە، یەکێك لەوانە ناوی (سفانە) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ڕێزی ئەو ئافرەتەی گرت، ئەوە وای کرد براکەی ئەو ئافرەتە موسڵمان ببێت.[1]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت پێش ئەوەی دوژمنان هێرش بکەنە سەر ئێمە و بێن بۆ لامان، ئێمە خۆمان ئامادە بکەین و بتوانین هێندە بە یەکەوە بین کە سەرکەوین بە سەریاندا.

٢- نابێت موسڵمان هەڵخەڵەتێت بە ژمارەی زۆر و بڵێت ژمارەمان زۆرە بۆیە سەردەکەوین لە کارەکانمادا، بەڵکو سەرکەوتن بە زۆر و کەمی نیە، سەرکەوتن بەوەیە ئێمە ڕاستگۆ بین لەگەڵ خوای گەورە و خۆڕاگر بین و باوەڕمان وابێت خوای گەورە یارمەتیمان دەدات، ئەگەر بەو جۆرە بین ئەوا سەردەکەوین، بەڵام ئەگەر وا نەبین سەرناکەوین.

٣- ئەگەر موسڵمانان لەجەنگدا، یان لە کارێکدا ترسان دەبێت ئێمە ورە، یان پێ بدەین و نەهێڵین بترسن و ڕابکەن، بۆ نموونە ئەگەر خوێندکارێکی هاوڕێمان ترسا لە خوێندن دەبێت ئێمە ورەی پێ بدەین تا واز نەهێنێت لە خوێندن، بەڵکو درێژەی پێ بدات.

---

[1]. محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٣٨٢).

٤- هەر شتێك خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری لەسەر بدەن دەبێت ئێمەش بە گوێیان بکەین، پارەی دنیاش ئەوەندە گرنگ نیە کە لە هەموو شتێك لە لامان گرنگتر بێت، بەڵکو گرنگترین شت بوونی ئیمان و خۆشەویستی خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ)و ئیسلام و موسڵمانانە.

٥- گەڕان بە دنیادا کارێکی باشە، بەڵکو موسڵمانان دەبێت بگەڕێن بە شوێنەکاندا تا پەند و ئامۆژگاری و شت فێر بن.

## * جەنگی تەبووك:

پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان لە مەککەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە و لەوێ مانەوە دەسەڵاتی بەهێزی ڕۆمەکان ویستیان هێرش بکەنەسەر موسڵمانان تا موسڵمانان لەناوبەرن، چونکە ئەوان دەترسان ڕۆژێك موسڵمانان سەرکەون بەسەر ئەوانیشدا، پێغەمبەر(ﷺ)یش بڕیاریدا هەموو موسڵمانان خۆیان کۆبکەنەوە بۆ جەنگ کردن دژ بە ڕۆمەکان و جارێکی تر هێرش بکەنە سەریان، هەرچی موسڵمانان هەبوون خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگەکە جگە لەوانەی پێغەمبەر(ﷺ) داینابوون تاکو کاروباری مەدینە ببەن بەڕێوە،[1] هەروەها سێ کەس لە موسڵمانەکانیش تەمبەڵیان کرد و خۆشەویستی دنیا و ترسان لە مردن وای لێ کردن نەچن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا پاداشتی جیهاد لە دەست بدەن.[2]

هەرچی دووڕووەکانیش بوون دەچوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) و بیانوویان دەهێنایەوە کە ناتوانن بچن بۆ ئەو جەنگە، پێغەمبەر(ﷺ)یش دەیزانی کە ئەوانە درۆ دەکەن و دووڕوون بۆیە مۆڵەتی پێدان تا نەیەن و لە شاردا بمێننەوە.[3]

موسڵمانێکی زۆر زۆر بە چەك و ئاژەڵ و کەل و پەلەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا کەوتنەڕێ و بەردەوام ماوەیەکی زۆر بەڕێکەتن، لە ڕێگەدا توشی تونێتی و برسێتی بوون بەڵام خوای

---

[1]ـ ابن هشام: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٠٢٣).
[2]ـ د. علي محمد محمد الصلابي، السيرة النبوية، لاپەڕە (٨٣١).
[3]ـ د.محمد عبدالقادر ابو فارس: الصراع مع الصليبيين، لاپەڕە (١٦٨).

گەورە یارمەتی دان و ڕزگاری کردن لەو تینوێتی و برسێتیە، کۆمەڵێك لە موسڵمانەکانیش کە چەك و کەل و پەلیان نەبوو نەیان توانی بچن بۆ جەنگەکە، ئەوان زۆر خەفەتیان خوارد و دەستیان کرد بە گریان، بەڵام خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی ڕاگەیاند کە ئەوانە تاوانبار نین و خوای گەورە دەزانێت کە ڕاست دەکەن.[1]

هەروەها ژن و منداڵ و پیاوە پیرەکانیش نەچووبوون بۆ جەنگەکە و لەمەدینەدا بوون و چاوەڕێی هەواڵی موسڵمانەکانی تریان دەکرد تا بزانن ئایا سەردەکەون یان دەشکێن.

کەسە دووڕووەکانیش هەمیشە چاوەڕێی ئەوەبوون موسڵمانەکان شکست بخۆن چونکە دەیان وت ڕۆمەکان زۆرن و بەهێزن، هەرگیز موسڵمانەکان ناتوانن سەرکەون بەسەر ئەواندا، ئەوان بەم قسانە زۆر دڵخۆش بوون.

لە ڕێگەدا کۆمەڵێك لە مەسیحیەکان تووشی کۆمەڵی لە موسڵمانەکان بوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێککەوتنی لەگەڵدا کردن و لێی نەدان، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسین تا ئەگەر موسڵمانان ویستیان لێیان بدەن، ئەوان بڵێن ئەوە نامەی پێغەمبەرەکەتانە کە ڕێگە نادات ئێوە لە ئێمە بدەن.[2]

پاشان کە گەیشتنە تەبوك بۆ ماوەی ١٨ ڕۆژ لەوێ مانەوە، ڕۆمەکان نەیان توانی جەنگ بکەن لەگەڵ موسڵمانەکاندا، بۆیە موسڵمانەکان گەڕانەوە بۆ مەدینە و سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا و دووڕووەکان زۆر خەفەتیان خوارد.[3] کاتێك چوونەوە بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە موسڵمانەکان کە هیچ کات قسە نەکات لەگەڵ ئەو موسڵمانانەدا کە تەمبەڵیان کرد و نەچوون بۆ جەنگەکە و لە ماڵەوە بۆ خۆیان دانیشتن.[4]

پرسیار: ئەو سێ موسڵمانە کێ بوون کە تەمەڵیان کرد و نەچوون بۆ تەبوك؟

---

[1] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السيرة النبوية، لاپەڕە (٨١١-٨١٢).

[2] . محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٣٨٧).

[3] ـ د. حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٢١).

[4] ـ د.محمد عبدالقادر ابو فارس: الصراع مع الصليبين، لاپەڕە (١٨٧-١٨٩).

وەڵام: ئەوانە بریتی بوون لە (کەعبی کوڕی مالك، هیلالی کوڕی ئومەییە، موراڕەی کوڕی ڕەبیع) کە دانیان نا بە هەڵەی خۆیاندا.[1] ئەو سیانە زۆر دڵتەنگ بوون و نەیان دەزانی چی بکەن، هیچ کەس قسەی نەدەکرد لەگەڵیاندا تەنانەت ژنەکانیشیان.

پرسیار: پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی ئەم فەرمانەی کرد بە موسڵمانان؟

وەڵام: چونکە خوای گەورە فەرمانی کردبوو تا ئەوانە فێر بکات جارێکی تر وانەکەن، بەڵام دوای ماوەیەك خوای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) هەتا فەرمان بکات بە موسڵمانان تا قسەیان لەگەڵ بکەن، چونکە خوای گەورە لە گوناهەکەیان خۆش بووە.

کەسە دووڕووەکانیش مزگەوتێکی گەورەیان دروست کردبوو بۆ ئەوەی دوو مزگەوت هەڵپە و ناکۆکی بخاتە نێوان موسڵمانانەوە، چونکە ئەوان مزگەوتەکەیان لەبەر خوای گەورە دروست نەکردبوو، بۆچە خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەو مزگەوتەی دووڕووەکان دروستیان کردووە بیڕوخێنن، پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانەکان ڕوخاندیان.[2] دوای ئەوە لە تائیفەوە وەفدێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بونی تائیفی ڕاگەیاند، بەو جۆرە ئەو تائیفەی کە بەردیان دەوەشاند بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتاییدا موسڵمان بوون.[3]

دواتر لە ساڵی ٩ی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ئەبو بەکری صدیق تا بڕوات و حەج بکات بۆ موسڵمانان، کۆمەڵێك موسڵمانیش لە مەدینەوە چوون لەگەڵ ئەبو بەکردا و لە مەککە ئەبو بەکر حەجی کرد بە موسڵمانەکان و دواتر لەگەڵ موسڵمانەکانی مەدینەدا گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[4]

---

[1]. محمد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، لاپەڕە (٢٩٨-٣٠٠).

[2]- ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٦٠٨).

[3]. ابن هشام: السيرة النبوية، لاپەڕە (١٠٤٠-١٠٥٨).

[4]- ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٦٢١).

## * حەجیماڵئاوایی:

لە ساڵی ١٠ی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە موسڵمانانەدا بچن بۆ حەجی ماڵی خوا کە ئەو حەجە ناسراوە بە حەجی ماڵئاوایی.[1]

پرسیار: بۆچی بەو حەجە دەوترێت حەجی ماڵئاوایی؟

وەڵام: چونکە ئەو حەجە کۆتا حەجی پێغەمبەر(ﷺ) بوو دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ موسڵماناندا پێکەوە ئەو حەجەیان کرد لەو حەجەدا موسڵمانان گوێ بیستی فەرمان و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون کاتێك وتاری بۆ دەدان و ئامۆژگاری دەکردن کە نوێژ بکەن و ئازاری ئافرەتان نەدەن و یەکتر نەکوژن و دژ بە یەکتر نەبن و چەندین ئامۆژگاری بۆ دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە.[2]

## * کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ):

دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە، لە کۆتاییەکانی مانگی سەفەری ساڵی ١١ی کۆچیدا هەستی بە ئازار و سەر ئێشەیەك کرد و تا و گەرما گرتی پاش ئەوەی چوویە سەر گۆڕێك بۆ ناشتنی موسڵمانێك، پێغەمبەر(ﷺ)ڕۆژ بە ڕۆژ ئازار و ناڕەحەتیەکەی زیادی دەکرد و هاوەڵانی یارمەتیان دەدا تا بچێت بەڕێوە و دەست نوێژ بگرێت.[3]

ئەو ئازیزەمان هەموو ژنەکانی خۆی کۆکردەوە و داوای کرد یارمەتی بدەن تا لە ماڵی عائیشەدا بێت، چونکە ئەو بە سەرە دەچوو بۆ لایان، ژنەکانیشی ڕازی بوون، پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی عائیشەدا کۆتا ساتەکانی ژیانی دەبردە سەر، هەردەم بە ئاوی سارد فێنکیان دەکردەوە، بەڵام زیاتر ئازاری هەبوو.[4]

---

[1] ـ محمود شاکر: خاتم الانبیاء والمرسلین، لاپەڕە (٣٩٧).
[2] ـ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد (ﷺ)، (٤٥٠-٤٥٨).
[3] ـ ابن کثیر: البدایة والنهایة، بەرگی یەکەم، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٢٥٩).
[4] ـ د. علی محمد محمد الصلابی، السیرة النبویة، لاپەڕە (٨٨٤).

ڕۆژێکیان ویستی نوێژ بکات بۆ موسڵمانان و داوای کرد ئاوی بەسەردا بکەن تا باش بێت و نوێژیان بۆ بکات، بەڵام پێغەمبەر گیان بورایەوە، سێ جار وایان لێ کرد بەڵام هەر بورایەوە، تا دوایی فەرمانی کرد ئەبو بەکر نوێژیان بۆ بکات، لە کۆتا ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)دا موسڵمانان نوێژیان بۆ دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کردن، موسڵمانان وایان زانی پێغەمبەر(ﷺ) چاك بووەتەوە، کەچی نەیان زانی ئەوە کۆتاجارە پێغەمبەری ئازیز سەیریان بکات و سەیرکردنی ماڵئاواییە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سەری نایە سەر ئەژنۆی عائیشە و منداڵ و نزیکەکانی لە دەوروبەری کۆبوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لا الا الله إنّ للموت سكرات))، ئای کە مردن ئازاری زۆرە، دوایی سەیری ئاسمانی کرد و گیانی پیرۆزی دەرچوو، یاخوا بەقوربانی خۆت و ڕێبازەکەت بین ئەی پێغەمبەر گیان(ﷺ) ئەی خۆشەویستمان! ئەی مامۆستامان! ئەی ئەو کەسەی لە دایك و باوك و خۆشك و برامان باشتری بۆمان.[1]

## * هەڵوێستی عومەری کوڕی خەتاب:

عومەری کوڕی خەتاب کاتێك خەڵکی دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، تووڕە بوو و شمشێرەکەی هەڵگرت و هاواری کرد هەر کەس بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) مردووە دەیکوژم، بەڵام ئەبو بەکر هات و پێی وت پێغەمبەر(ﷺ) مردووە و دەبێت باوەڕ بکەین، بەڵام خوای پێغەمبەر(ﷺ) نەمردووە و لەگەڵماندایە.[2]

## * پەند و ئامۆژگاری:

١- دەبێت بۆ هەر کاتێك ئێمە مۆڵەت وەربگرین، سەیرکەن پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی لە خێزانەکانی خۆی وەرگرت ئینجا چوو بۆ ماڵی عائیشەی خێزانی.

٢- مردن شتێکی ڕاستە و هەموومان دەبێت بمرین، بەڵام گرنگ ئەوەیە خۆمان ئامادە بکەین بۆ دوای مردن و چاکەمان زۆر بێت.

---

[1] ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، لاپەڕە (٤٠٦-٤٠٩).
[2] ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، لاپەڕە (٧١٣).

٣- ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) یان زانایان یان خزمەکانمان بمرن، خۆ خودای ئەوان ماوە و لەگەڵماندایە، بۆیە دەبێت خودامان لەبیر نەچێت.

## پرسیارەکانی بەشی یانزەهەم

١- موسڵمانان بۆچی جەنگی حونەینیان کرد؟

٢- دەستکەوتی جەنگ چی پێ دەوترێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی حونەیندا چی کرد لەو دەستکەوتانە؟

٣- تائیف چۆن ئازاد کرا؟

٤- پشتیوانەکان کاتێك دەستکەوتی جەنگیان دەست نەکەوت چیان کرد؟

٥- پێغەمبەر(ﷺ) چۆن وەڵامی پشتیوانەکانی دایەوە؟

٦- بۆچی جەنگی تەبووك ڕوویدا؟

٧- ئەو سێ موسڵمانە کێ بوون کە تەمبەڵیان کرد و لە جەنگی تەبووك دەرکەوتن؟

٨- بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) مزگەوتی دووڕووەکانی ڕووخاند؟

٩- حەجیماڵئاوایی لە چەندی کۆچیدا ڕوویدا؟

١٠- بۆچی بە حەجی ساڵی ١٠ی کۆچی دەوترێت حەجی ماڵئاوایی؟

١١- پێغەمبەر(ﷺ) کەی کۆچی دوایی کرد؟

١٢- پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە کێ کرد تا بەر نوێژی بکات بۆ موسڵمانان؟

١٣- پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کۆچی دوایی کرد، عومەری کوڕی خەتاب چ هەڵوێستێکی

١٤- تۆ هەڵوێستت چیە بە کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)؟

# بەشی دوانزەهەم

## لە ژیانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەمانە فێر دەبین:

### ١- خۆڕاگری:

پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە منداڵیەوە ژیانێکی سەخت و ناڕەحەتی هەبوو، هەر لە دایك و باوکی خۆی نەبینی، چونکە ماوەیەکی کەم لە پێش لە دایك بوونیدا باوکی مرد، پاشان دایکی خۆی بەجێهێشت و چوو بۆ لادێ، پاشان دایکی لەگەڵیدا بوو چوون بۆ گەشت و گەڕان، لە ناکاودا مرد، پاشان باپیرەشی مرد.

مامیشی پیر و کەم دەست بوو، بۆیە ناچار پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە کاری شوانەیی کردن هەر لە منداڵیەوە، کاتێکیش کە گەورە بوو کەوتە ئیشەکانی تر، پاشان کە بوو بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خەڵکی کەوتنە گاڵتەپێکردن و ئازاردانی و ناڕەحەتیان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) تووشی برسێتی و تینوویەتی بوو، کوڕەکانی مردن، پاشان سێ ساڵ لە شیوی ئەبوتالیبدا بەبێ نان و ئاوی پێویست بە ناڕەحەتی ژیا، دوایی خەدیجەی ژنی و ئەبو تالیبی مامی هەردووکیان مردن، دوایی ئازاری زۆرتر دەدرا و بەردباران دەکرا، پێیان دەوت شێت و جادووکەر و نەزان و تەمبەڵ و گەمژە و درۆزن و شاعیر و لاسار و هەر قسەیەکی تری ناشرین.

پاشان لە شارەکەی خۆیدا دەریان کرد، دوای ئەوەش کەوتنە جەنگ کردن لەگەڵیدا، پێغەمبەر(ﷺ) هێندە برسی دەبوو، بەردی دەبەست بە سکیەوە، هێندە گاڵتەی پێ دەکرا خەریك بوو خۆی بکوژێتەوە، بەڵام خوای گەورە ڕێگەی پێ نەدا، بەڵێ ئازیزان بە جوانی سەیر بکەن ئەمە ژیانی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)، هەر لە منداڵیەوە تا مردن بەردەوام لە ناخۆشی و ناڕەحەتی دا بووە، بەڵام ئەو ئازیزەمان هەرگیز وازی نەهێنا و بەردەوام بوو تا سەرکەوت و توانی بە جوانی ئایینی خوای گەورە بگەیەنێت بە مرۆڤایەتی، منداڵان و تازەپێگەیشتوانی ئازیز! ڕۆڵە دڵ گەرمەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام! ئەگەر بمانەوێت موسڵمان بین و وەك پێغەمبەر(ﷺ) بژین و خەڵکی فێری چاکە بکەین، دەبێت هەمیشە

خۆڕاگر بین و ئەگەر ناڕەحەتی و برسێتی و ئازار و تینوێتیمان تووش بوو واز نەهێنین و بڵێین خودا گیان تۆمان بەسە، خوایە گیان ئێمە لەبەر تۆ خۆمان دەخەینە ئەم سەختیە دەی تۆش لێمان قبوڵ بکە.

## ٢- ڕاستگۆیی:

پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانیدا هەرگیز درۆی نەدەکرد، بەڵکو هەمیشە بە ڕاستگۆیانە قسەی دەکرد و هەر کەس پرسیاری لێ بکردایە بە ڕاستگۆیی وەڵامی دەدایەوە، چونکە زۆر ڕقی بوو لە درۆکردن و کەسی درۆزن، تەنانەت هەرچی خەڵکە پێیان دەوت محمدی ڕاستگۆ، بێباوەڕەکانیش سەرەتا وایان پێ دەوت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: هەر کەس درۆ بکات و واز نەهێنێت لە درۆکردن، لە لای خوای گەورە ناوی بە درۆزن دەنووسرێت، ئینجا خوای گەورە بە درۆزن دەیناسێت، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەیە کە درۆ دەکەن، ئەگەر منداڵێکمان بانگ کرد و وتمان وەرە با شتێکت بدەمێ، بەڵام شتەکەمان پێ نەدا و درۆمان کرد لەگەڵیدا، ئەوا خوا بە درۆ بۆمان دەنووسێت و دەبێتە تاوانێك کە دەبێتە هۆی ئەوەی بچینە دۆزەخەوە، هاوەڵەکانی پێغەمبەریش هەرگیز درۆیان نەدەکرد، هەوڵیان دەدا بە ڕاستگۆیانە قسە بکەن، چونکە لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە فێری ڕاستگۆیی بووبوون.

## ٣- دەست پاکی:

پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز ماڵ و سامانی خەڵکی نەدەخوارد، بەڵکو بە تەواوەتی ئەمانەت و ڕاسپاردەی خەڵکی دەپاراست، بۆیە خەڵکی پێیان دەوت محمدی دەستپاك و زۆر ڕێزیان لێ دەگرت لەبەر دەست پاکیەکەی، هەموو خەڵکی تەنانەت بێباوەڕەکانیش ڕاسپاردە و ماڵ و سامانی خۆیان دەدایە لای پێغەمبەر(ﷺ) چونکە دەیان زانی ئەو دەیانپارێزێت و ناپاکی ناکات.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: یەکێك لە سیفەتەکانی دووڕوو ئەوەیە کە کاتێك ئەمانەتێکی درایە دەست، ناپاکی لێ دەکات، جا کەسێك ناپاکی کرد ئەوە سیفەتی دووڕووی هەیە و خوای گەورە ڕقیەتی لەو ئیشەی، هەروەها نابێت هەرگیز دزی بکەین و ماڵی خەڵکی

ببەین، هەروەها نابێت نان و پارەی ماڵی هەتیوان بدزین، چونکە هەر کەس دزی کرد، ئەوا سزای سەختی دۆزەخ چاوەڕوانی دەکات و خوای گەورە ڕقی دەکەوێت لێی.

بۆیە لە ئیسلامدا هەر کەس دزی بکات، ئەوا دەوڵەتی ئیسلامی دەستی دەبڕێت، منداڵانی موسڵمانیش دەبێت خۆیان بە دەست پاکی فێر بکەن و هەرگیز ناپاکی نەکەن.

## ٤- ئیشکردن:

منداڵانی ئازیز کاتێك باسی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)مان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە منداڵیەوە کەوتە ئیشکردن و چوو بۆ کاری شوانەیی، چونکە باپیرە و مامی پیر بوون و نەیان دەتوانی ئیش بکەن و پارەی کەمیان هەبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە منداڵیەوە چوو بۆ ئیشکردن تا یارمەتی باپیرە و مامی خۆی بدات و فێری ئیشکردن ببێت، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بەوە وازی نەهێنا، بەڵکو کەوتە فێربوونی ئیشی تریش، وەك ئەوەی خۆی فێری کاری بازرگانی کرد، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) لەمەککەوە دەچوو بۆ شوێنە دوورەکان و لەوێ شتی دەکڕی و دەفرۆشت و دەگەڕایەوە بۆ مەککە.

ماوەیەك پێغەمبەر(ﷺ) ئیشی بازرگانی دەکرد بۆ خەدیجەی کچی خوەیلید، بۆیە دەبێت منداڵی موسڵمان خۆی فێری ئیشێك بکات، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: خوای گەورە کەسێکی خۆش دەوێت کە لە ئیش بزانێت، ئیتر با هەر منداڵێکی موسڵمان خۆی فێری ئیشێکی گرنگ بکات، با یەکێك خۆی فێری سەرتاشین و یەکێك خۆی فێری شت دروستکردن و یەکێك خۆی فێری کشتوکاڵ و یەکێك خۆی فێری کڕین و فرۆشتن و دوکانداری بکات، منداڵی موسڵمان دەبێت بەتاڵ نەبێت و هەرچۆنێکی کردبێت ئیشێك بکات کە سوودی هەبێت بۆ خۆی و ماڵ و کەسان و موسڵمانان، چونکە کە کاتەکەی چوو ناگەڕێتەوە.

## ٥- فێربوونی زانست:

پێغەمبەر(ﷺ) خۆی نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆر گرنگی دەدا بە زانست و زانیاری و یەکەجا بوو بە پێغەمبەر خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە بخوێنێت و دەست بکات بە خوێندن، چونکە یەکەم ئایەت بریتی بوو لە (إقرأ) واتا: بخوێنە، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)

کاتێك کە دیلەکانی بەردان لە جەنگی بەدردا، بە مەرجێك بەری دەدان کە دەبێت هەر یەکەیان دە منداڵی موسڵمان فێری خوێندەواری بکات.

پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات ڕێزی زانایان بگرین و لێیانەوە فێری زانست ببین، هەر کەسێکمان بینی هەوڵی فێربوونی زانست دەدات بە هەموو شێوەیەك یارمەتی بدەین، ئەگەر پارەی زیادمان هەبوو و ویستمان بیکەین بەخێر با بیدەین بە زانستخوازان. موسڵمانانی ئازیز، سەیرکەن ئەم ڕۆژە بێباوەڕان فێری زانستی جۆراوجۆر بوون، چۆن بەهێز بوون و سەرکەوتن بەسەر موسڵماناندا، دەی کێ دەیەوێت ئاینی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) سەربخات، با دەست بکەن بە فێروونی زانست و خەڵکی فێری زانست بکەن، چونکە موسڵمانان کاتێك سەردەکەون کە وەك موسڵمانانی زوو دەست بکەن بە وەرگرتنی زانست.

## ٦- دڵسۆزی:

موسڵمان دەبێت زۆر دڵسۆز بێت بەرامبەر بە مرۆڤایەتی بە گشتی و بەرامبەر بە موسڵمانان بە تایبەتی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە دڵسۆزی خوی دەنواند بەرامبەر بە هەموان و گوێی بە ئازار و ماندووبوون نەدەدا، پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی دەدا خەڵکی ڕزگار بکات لە نەزانی و گومڕایی و ئاگری دۆزەخ، کە خەڵك قسەیان پێ دەوت و گاڵتەیان پێ دەکرد، تەنانەت بەردبارانیان دەکرد و لەشی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)یان پڕکرد لە خوێن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دوعای خێری بۆ دەکردن و هەوڵی دەدا ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدات و وازی نەدەهێنا، منداڵانی ئازیز دەبێت ئێمەش بەو جۆرە دڵسۆز بین و سەختی و ناڕەحەتی ژیان وامان لێ نەکات کە واز بهێنین لە دڵسۆزی و دەست بەردەین لە چاکە.

## ٧- نیازپاکی:

دەبێت موسڵمان کاتێك کارێکی چاکە دەکات تەنها و تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا بیکات، نابێت لەبەر ئەوە کاری چاکە بکات کە خەڵکی لە پاشەوە وەسفی بکەن و خۆشیان بوێت و بڵێن کەسێکی چاکە، کاتێك پارە دەدەیت بە کەسێك نابێت لەبەر ئەوە بیکەیت کە خەڵکی بیزانن، یان کاتێك نوێژ دەکەیت، نابێت لەبەر ئەوە بیکەیت کە خەڵکی بڵێن

کەسێکی موسڵمانە و ئافەرینی بێت. پێغەمبەر(ﷺ) هەر شتێکی دەکرد نیازی پاك بوو، تەنها لەبەر خوا دەیکرد.

## ٨- ئازایەتی و نەترسی:

منداڵی موسڵمان دەبێت ئازا و چاو نەترس بێت، لە هیچ شتێك نەترسێت جگە لە خوای گەورە، چونکە هەموو شتەکان دروستکراوی خوای گەورەن، ناتوانن هیچ شتێك بکەن ئەگەر خوای گەورە ڕێگەیان پێ نەدات، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئازا و دلێر و چاو نەترس بووە، خۆی لە جەنگەکاندا بەشداری دەکرد، نەدەترسا کە بێباوەڕان بیکوژن، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) منداڵانی موسڵمانیشی فێری ئازایەتی کردبوو، وەك دەبینین دوو منداڵی موسڵمان هەڵدەستن بە کوشتنی سەرکردەی گەورەی بێباوەڕەکان کە ناوی ئەبو جەهل بوو.

## ٩- خۆشەویستی خوای گەورە:

پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورەی زۆر خۆش دەویست، ئامادەبوو لە پێناوی خوای گەورەدا هەموو کارێکی چاك و جوان بکات، ئەو بە شەو و ڕۆژ نوێژی دەکرد بۆ خوای گەورە و ڕۆژووی دەگرت لە پێناوی خوادا و خۆی لە هەموو تاوانێك بەدوور دەگرت تا خوای گەورە تووڕە نەکات، چونکە هەر کەس خوای خۆی خۆش بوێت، خوای گەورەش ئەوی زۆر خۆش دەوێت.

## ١٠- ڕێزگرتن:

هیچ کات کەس نەبوو بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی نەگرتم، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی هەموو کەسی دەگرت و سووکایەتی بە کەس نەدەکرد، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی بێباوەڕەکان و دووڕووەکانیشی دەگرت، سەیری ئەو کاتە بکەن کە دوژمنانی ئیسلام دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کەچی ئەو ئازیزەمان ئەو دوژمنانەی لە شوێنەکەی خۆی دادەنا و ڕێزی لێ دەگرتن، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی سەرکردەی دووڕووەکانیش عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕە سەلولی دەگرت.

## ١١- یارمەتیدان:

ژیانی پێغەمبەرمان پڕە لە یارمەتیدان و هاوکاری، پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتی هەر کەسێکی دەدا کە پێویستی بە یارمەتی هەبووایە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەوەدا بوو یارمەتی خێزانەکانی دەدا، کاتێکیش دەچوو بۆ دەرەوە یارمەتی پیر و هەژارانی دەدا، جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) پیرەژنێکی بینی بارێکی قورسی پێ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ یارمەتیدانی و کۆڵەکەی بۆ بردە شوێنی مەبەست، هاوەڵانی بەڕێزیش بەو جۆرە بوون بەتایبەتی (ئەبو بەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب) بۆیە دەبێت ئێمەی موسڵمانیش یارمەتی خەڵك بدەین و نەڵێین عەیبە یان ناتوانین یان هەقمان نیە.

## ١٢- خۆشەویستی موسڵمانان:

موسڵمان ئەو موسڵمانەیە کە برا موسڵمانەکەی خۆش بوێت و لەگەڵیدا چاك بێت، چونکە موسڵمانان هەموو برای یەکترن، پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەکانی خۆی زۆر خۆش دەویست و ڕێزی لێ دەگرتن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت بە موسڵمانان (هەر کامتان برا موسڵمانەکەی خۆی خۆش دەوێت با پێی بڵێت من لە پێناوی خوادا تۆم خۆش دەوێت)، ئەگەر دوو موسڵمان لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا لەژێر سێبەری خوای گەورەدان.

## ١٣- پەرستش بۆ خوای گەورە:

ژیانی پیرۆز و پڕ بەرەکەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی بریتی بوو لە پەرستش بۆ خوای گەورە، شەو بە ڕۆژ و بە شەو نوێژی فەرز و سوونەتی ئەنجام دەدا و ڕۆژووی فەرز و سوونەتیشی دەکرد، هەموو کات زیکری خوای گەورەی دەکرد، هیچ کات بەبێ پەرستش نەبوو، چونکە پەرستش تەنها نوێژ و ڕۆژوو نییە، بەڵکو پەرستش هەموو کارێکی چاك و خێرە کە لە پێناوی خوای گەورەدا موسڵمان هەوڵی بۆ بدات، تەنانەت زەردەخەنەیەکیش پەرستشی خوای گەورەیە، چونکە دڵی موسڵمانێکی پێ خۆش دەکەیت، بۆیە دەبێت ئێمەش لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە فێری پەرستش ببین.

## ١٤- پاك و خاوێنی:

یەکێك لە سیفەتەکانی موسڵمان بریتیە لە پاك و خاوێنی و خۆ دوور گرتن لە پیسی و چەپەڵی، چونکە خوای گەورە جوانە و کەسی جوانیشی خۆش دەوێت، هەروەها ئیسلام پاکە و دەبێت ئێمەش پاك بین، پێویستە موسڵمان هەموو رۆژ دەست نوێژ بگرێت، کە لە خەو هەستا دەست و دەم و چاوی بشوات و جلوبەرگەکەی تەواو پاك و خاوێن بێت، بۆنی خۆش لە خۆی بدات، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) زۆربەی پارەکەی خۆی دەدا بە بۆنی خۆش، هەروەها قژەکانی زۆر بە جوانی دادەهێنا و جلوبەرگەکەی زۆر بە پاکی دەپاراست، موسڵمان دەبێت بە لایەنی کەمەوە هەفتەی یەك جار خۆی بشوات، واتا حەوت رۆژ جارێك خۆی بشوات.

## ١٥- جەنگکردن لەگەڵ دوژمناندا:

منداڵانی ئازیز ئیسلام پێمان دەفەرموێت خۆتان دوور بگرن لە جەنگ و خوێن رێژی، هەوڵ بدەن پێکەوە تەبا بن و بە قسە و رەفتاری خۆش پێکەوە بژین، چونکە هەر کەس خوێنی مرۆڤێك برێژێت ئەوە وەك ئەوە وایە هەموو مرۆڤەکانی کوشتبێت، تەنانەت ئەگەر مرۆڤەکە بێباوەڕیش بێت، نابێت لە خۆتەوە بیکوژیت.

بەڵام ئەو کەسانەی دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەر و موسڵمانان دەکەن، هەر لە خۆوە هێرشیان دەبەنەسەر و قسەیان پێ دەڵێن، ئەوا دەبێت ئەو کەسانە لێیان بدرێت و نەهێڵین لە خۆیانەوە ستەممان لێ بکەن، چۆن پێغەمبەر(ﷺ) دژی ستەم بوو.

## ١٦- نەرم و نیانی ڕووخۆشی و تووڕە نەبوون:

موسڵمان نابێت تووڕە و دەم و چاو گرژبێت، بەڵکو سیفەتی موسڵمان ئەوەیە کە هەمیشە ڕووی خۆش و لێو بە خەندەیە بەرامبەر بە موسڵمانانی تر، دەبێت موسڵمان زۆر نەرم و نیان بێت و لە خۆوە تووڕە نەبێت، چونکە تووڕەیی سیفەتێکی خراپە، پێغەمبەر(ﷺ) کەسی ئازا ئەو کەسەیە کە لە کاتی تووڕەییدا خۆی بگرێت و واز بهێنێت لە تووڕەیی، چونکە ئەنجامەکەی خراپ دەبێت، ئێمە دەبێت کاتێك تووڕە بین کە تووڕەییەکەمان سوودی هەبێت،

نەك هەر شتێكمان بینی لە خۆمانەوە تووڕە ببین، لە ڕاستیدا خەڵك حەز ناكات گوێ بگرێت بۆ كەسێكی تووڕە و كەس حەز ناكات ژیان بباتەسەر لەگەڵیدا.

## ١٧- خۆشەویستی دایك و باوك:

دایك و باوكی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە منداڵی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە مردن و ژیانێكی زۆریان پێكەوە نەبردەسەر، هەروەك دایك و باوكی پێغەمبەر(ﷺ) بێباوەڕبوون چونكە وەك خەڵكی تر دابوویانە بێباوەڕی، بەڵام ڕەفتار و ناكاریان خراپ نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دەگریا و هەمیشە دوعای دەكرد كە خوای گەورە لێیان خۆش ببێت، بەڵام خوای گەورە فەرمووی دوعای وا مەكە، پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە دەچوویە سەر گۆڕی هەردووكیان و سەردانی دەكردن منداڵانی نازیز، پێویستە ئێمە دایك و باوكی خۆمان زۆر خۆش بوێت بە تایبەتی سوپاس بۆ خوا كە موسڵمانن، ئەگەریش بێباوەڕ بن دەبێت هەر ڕێزیان لێ بگرین و خۆشمان بوێن، بەڵام ئەگەر ویستیان گوناهمان پێ ئەنجام بدەن ئەو كاتە نابێت بە گوێیان بكەین لەو گوناهەدا.

## ١٨- قسەی جوان كردن:

قسەی جوان لە گوڵی جوان و بۆن خۆش جوانتر و باشترە، هەموومان پێویستمان بە قسەی جوان و باش هەیە، پێویستە كە موسڵمان هەمیشە قسەی جوان بكات، نابێت موسڵمان قسەی ناشیرین بڵێت و جنێو بدات، چونكە ئەوە گوناهە و خوای گەورە ڕقیەتی لەو كەسانە، پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك قسەی دەكرد قسەكانی ئەوەندە جوان و خۆش بوون هەموو موسڵمانان و خەڵكی حەزیان دەكرد گوێی لێ بگرن، هیچ كات پێغەمبەر(ﷺ) جنێوی نەدەدا بە خەڵكی، بەڵكو سەیری دەكرد بزانێت خەڵكی حەز بە چ قسەیەك دەكەن، ئەگەر ئەو قسەیە باش بوایە ئەوا بۆی دەكردن.

## ١٩- غەیبەت نەکردن:

غەیبەت کردن واتا باسی برا موسڵمانەکەت بە شێوەیەك کە پێی ناخۆش بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو کەسانەی غەیبەت دەکەن، وەك ئەوە وایە گۆشتی ئەو کەسە بخۆن بە مردوویی، ئەوانە گوناهبارن و خوای گەورە لەو دنیادا سزایان دەدات، پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانیدا غەیبەتی نەکردووە، بەڵکو زۆریش ڕقی لە غەیبەت بووە.

## ٢٠- قسە نەگێڕانەوە و فیتنەیی نەکردن:

قسە هێنان و بردن کارێکی زۆر تاوان و شەرمەزاریە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئەوەی فیتنەیی بکات و قسە بهێنێت و ببات ناچێتە بەهەشتەوە، تەنها دەبێت کاتێك قسە بگێڕێتەوە کە بێباوەڕان یان کەسانی خراپەکار بیانەوێت زیان بگەیەنن بە خەڵك و موسڵمانان، ئەو کات دەبێت کە خەڵکی ئاگادار بکەیتەوە لەو شتە.

## ٢١- دنیاپەرستی و ڕازی بوون:

ژیانی دنیا ماوەیەکی دیاری کراوە و لەچاو ڕۆژی دواییدا زۆر زۆر کەمە، نابێت موسڵمان وا بزانێت تەنها ئەم دنیایەی هەیە و هەمیشە لە هەوڵی ژیانی دنیادا بێت، بەڵکو موسڵمان دەبێت لە دنیادا کارێکی وا ئەنجام بدات کە سوودی بۆ قیامەتی هەبێت، چونکە هەموومان دەمرین، بەڵام نابێت واز لە ژیانی دنیاش بهێنین، بەڵکو دەبێت بەپێی پێویست گوێ بدەین بە دنیا و بەپێی پێویست گوێ بدەین بە ڕۆژی دوایی.

## ٢٢- خۆ دوورخستنەوە لە تاوان:

تاوان کردن زۆر کارێکی خراپ و پیسە و مرۆڤی پێ پیس و تاوانبار دەبێت، هەر کەس تاوان بکات ئەوا بەرەو دۆزەخ دەچێت، بۆیە دەبێت مرۆڤی موسڵمان زۆر خۆی بپارێزێت لە تاوان کردن، ئەگەریش تووشی تاوانێك بوو دەبێت بە پەلە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، بڵێت خوایە گیان ئەجارە ئەم تاوانە دووبارە ناکەمەوە وە لێم ببورە.

## ٢٣- چاککردنی پەیوەندی نێوان موسڵمانان:

پێغەمبەر(ﷺ) پەیوەندی نێوان هۆزی ئەوس و خەزرەجی چاك کرد کە پێکەوە جەنگیان دەکرد و یەکتریان دەکوشت، بۆیە دەبێت ئێمەش ئەگەر بینیمان پەیوەندی دوو کەس یان دوو هاوڕێمان تێك چووە، دەبێت پێکەوە ئاشتیان بکەینەوە، تەنانەت ئەگەر درۆیش بکەین بۆ ئەوەی ئاشت ببنەوە ئەوە گوناه نیە، واتا درۆ بکەیت تا ئاشتیان بکەیتەوە.

## ٢٤- سەردانی خزم و کەس و کار:

خزم و کەس و کار لە ئیسلامدا پلەیەکی بەرزیان هەیە و موسڵمان ناتوانێت خۆی دوور بخاتەوە لێیان، چونکە هەر کەس دوور بکەوێتەوە لە خزمەکانی ئەوا گوناهێکی گەورەی کردووە و خوای گەورە لێی دەڕەنجێت، پێغەمبەر(ﷺ)یش هەمیشە سەردانی خزم و کەس و کاری دەکرد، تەنانەت سەردانی خزمە بێباوەڕەکانیشی دەکرد و دەچوو بۆ لایان.

## ٢٥- دوعاکردن بۆ موسڵمانان:

پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) زۆر موسڵمانانی خۆش دەویست و هەموو کاتێك دوعای خێری بۆ دەکردن، خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو حەزت لە چیە داوای بکە با بۆت جێبەجێ بکەم، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: داوای هیچ ناکەم بۆ خۆم، بەڵکو دوعاکەی بۆ موسڵمانان بوو، منداڵانی ئازیز خۆیشت لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە هەندێك شت فێر ببە.

# لە کۆتاییدا:

منداڵی ئازیز، خوێنەری تازەپێگەیشتوو، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ)و شایەتی دەدەن، کە محمد(ﷺ) پێغەمبەری خوایە، ئەی ئەو کەسانەی زۆر حەز دەکەن بۆ یەك جاریش بێت پێغەمبەر(ﷺ) ببینن، ئەمە ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەمانە کە ئێوە زۆرتان خۆش دەوێت، بەجوانی ژیانەکەی بخوێننەوە و لێی تێ بگەن و لێی ورد ببنەوە و پەندی لێ وەربگرن، بزانن پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانیدا چی کردوە و ئێوەش وەك ئەو بکەن، تەنها بە یەکجار خوێندنەوەی ئەم ژیاننامەیە واز مەهێنن، بەڵکو چەندجار توانیتان بیخوێننەوە، هیچ نەبێت ساڵی یەك جار بیخوێننەوە، تا هەمیشە ژیانی ئەو ئازیزەتان لە بیر بێت، وەك ئەو ڕەفتار بکەن.

پێویستە ئێوەی خۆشەویست کاتێك ئەم ژیانە دەخوێننەوە، سوودی چاکی لێ وەربگرن و دوایی باسیشی بکەن بۆ کەسانی تر، بۆ برا و خوشکە بچووکەکانتان، بڵێن وەرن دانیشن با چیرۆکتان بۆ باس بکەم، ئەو کاتە هەر جارەو کەمێکی ئەم ژیانی پێغەمبەرە خۆشەویستەیان(ﷺ) بۆ باس بکە، تا ئەوانیش سوودی لێ وەربگرن.

لە کۆتاییدا داواکاریەکم هەیە لە ئێوەی خۆشەویست کە ئەویش داواتان لێ دەکەم کە دوعای خێرم بۆ بکەن و لە دوعاکانتاندا من لەبیر نەکەن، تاکە سوپاس و دەست خۆشیەك کە لە ئێوەم دەوێت ئەوەیە کە دوعای خێرم بۆ بکەن.

خوای گەورە لە گوناهەکانی من و ئێوەش خۆش ببێت و یارمەتیمان بدات تا بەجوانی ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان محمد (ﷺ) بزانین و لە ژیانی ڕۆژانەماندا سوودی لێ وەربگرین.

# بەشی سیانزەهەم

## کۆمەڵێك شیعر بۆ منداڵان

منداڵان و تازەپێگەیشتوانی ئازیز، لێرەدا هەندێ شیعری جوان و رێك و پێك هەمن کە دەتوانن لەبەریان بکەن و بیانخوێننەوە، ئەم شیعرانە هەندێکیان شیعی مامی ئازیزم (جمال حبیب الله بێدار)ن، هەندێکیشیان شیعری خۆمن بۆ ئێوەی ئازیز و خۆشەویست.

## پێغەمبەرەکەم

پێغەمبەرەکەم نەخوێندەوارە
بەڵام پەروەردەی پەروەردگارە
پێغەمبەرەکەم ڕاستگۆ و ئەمینە
وتەی دەرمانە بۆ دەردی سینە
سەرقافڵەی ڕێگەی جیهادکەرانە
خۆری ڕووناکی ناو ئەستێرانە
دالْدەی چەوساوە و لانەوازانە
هاندەری خێرخواز و هیمەت بەرزانە
پێغەمبەرەکەم هۆی بەختیاریە
هەر بەرنامەی ئەو هۆی ڕزگاریە
ئەوم لە گشت کەس زیاتر خۆش دەوێ
هەر ئەو ڕابەرمە لێرە یان لەوێ
ئەو مامۆستامە... هەر ئەو ڕابەرمە
خوایە شاهێدبە ئەو پێغەمبەرمە

جمال حبيب الله

# کوردێکی موسڵمانم

مــن کوردێکــی بــەدینــم
نــەوەی صــەلاحــەدینـــم
ڕزگاری ئــەم میللەتـــەم
لـــە ئیسلامدا دەبینـــم

٭ ٭ ٭

کـوردێـکی موسڵمانـــــم
مــن ڕۆڵــەی کوردستانــم
خـــەڵاتم بـانگی خوایـــە
بــۆ گــەل و نیشتمانـــــم

٭ ٭ ٭

کـوردێکی بـە غیرەتـــم
دژ بــە زوڵــم و زیللەتـــم
هەرگیز دەست بەردار نابـم
لە خـاك و لـە میللەتـــم

٭ ٭ ٭

کـوردێکی خـاوەن هـۆشـم
ئـــاو و خاکـم نـافرۆشـــم
بـۆ ســەربەستی و ئــازادی
تــەواو شەیـدا و پەرۆشـــم

* * *

کـــوردێکی مــوسڵمـانـــــم

ســــەربـازێکی قــورئـانـــــم

بـــۆ بـەرزی پـەیـامی خـوا

خـەڵاتـــە مــاڵ و گیـانـــــم

**جمال حبيب الله**

# ئەی موحەممەد

ئەی موحەممەد... ئەی موحەممەد

سەلامت لێ بێت تا ئەبەد

بەڵێ پێغەمبەری خودایت

خۆری ڕووی ئاسمانی دنیایت

لە تاریکی ژینا چرایت

دڵسۆزتر لە باوك و برایت

بۆیە سوورم هەتا ئەمرم

کە تەنها ڕێگەی تۆ بگرم

هەڵگری بانگی ئاسمانیت

هۆی سەرفرازی ئینسانیت

تەنها شوێنی تۆ دەکەوم

بە ڕێگاکەی تۆ ئەسرەوم

قوربانی قورئانەکەتم

شاگردی بەرنامەکەتم

جمال حبیب الله

# موسڵمانم

موسڵمانم... موسڵمانم
بە هەست و دڵ و زوبانم
هۆش و بیرم... سۆز و گیانم
هاوار دەکەم موسڵمانم

❁ ❁ ❁

موسڵمانم (الله) خوامە
موحەمەدیش پێشەوامە
لەناو ئەم هەموو عالەمە
من تەنها (کەعبە) قیبلەمە

❁ ❁ ❁

موسڵمانم رێی راست دەگرم
رێبواری رێی ئەبو بەکرم
موسڵمانم دادپەروەرم
من شاگردێکی عومەرم

❁ ❁ ❁

بۆ خەڵاتی گشت سامانم
من قوتابیەکی عوسمانم
شێرم... دوورم لە ترس و بیم
چونکە من پێشمەرگەی عەلیم

* * *

سوپاس بـۆ خوا موسڵمانـــم

هــەڵگری بـانـگی قورئانـــم

الله! الله! مــوســڵــمــانـــــــم

بــەشێوە و کردار ئینسانـــم

جمال حبيب الله

# محمد پێغەمبەرمە

محمد پێغەمبەرمە

خوێنی دڵ و جگەرمە

پێغەمبەرێکی وایە

مامۆستاکەی خودایە

سەرداری ئەنبیایە

پێشڕەوی گشت دنیایە

ئای کە ناوی شیرینە

ڕەحمەت بۆ عالەمینە

محمد پێغەمبەرمە

مامۆستامە... ڕابەرمە

بەرەو بەهەشتم ئەبات

لە ئاگر ئەمدا ئەجات

سەربازی پێغەمبەرم

بە ماڵ و گیان و سەرم

جمال حبیب الله

# موسڵمانم

منـداڵێکی کـوردسـتـانــــــم    پــەروەردەی ڕاستی قورئانـــــــم

هەتا ماوم هـــاوار دەکــــــەم    مــوسڵمانـــم... مــوسڵمانـــم

پێغـەمبەری خوام خۆش دەوێـت    حـــەز دەکەم ئیسلام سەرکــەوێـت

هەر کەس دژ بە ئیسلام هـــەبێ    دوژمنــە و هــەرگـیز نـامـــــەوێ

محـمد پـێغــەمــبـەرمـــانــە    خـۆشەویستــی هــەمــوومـانـــــە

گیانـمان دەکەین بە قوربــــانی    بــۆ ئــەم ئـیسلام و قـورئـانـــە

فێری خوێندەواری دەبـیــــــن    بــە چاکی و ڕاستگۆیی دەژیــــــن

پێغەمبەرمان چـــی فەرمـــووە    بــەگوێی دەکەین هەتا دەمریـــــن

ئــــەی مـنداڵان وەرن هەمــووان    یەك دەنگ بڵێین بۆ گشت جیهــــان

موسڵـمـانـی کـوردسـتـانـیـــن    خـۆشمان دەوێت پێغەمــبەرمـــان

نیهاد جلال حبیب الله

# پێغەمبەر گیان

قـوربانت بم پێغەمـبەرمـــــــان
ئەی سەرکردە و ئەی ڕابەرمـــــان
هەر تۆی مامۆستا و ئازیزمـــــان
ئێمەی منداڵی کوردستـــــــان

❋ ❋ ❋

تۆ کە نەخوێندەواری بوویـــــت
بە ویستی خوا بە پەلە چوویـــــت
بــۆ ئـاسـمـان و گەڕایتـــــەوە
بەڵێ تۆ ڕەحمەتی و هاتوویـــــت

❋ ❋ ❋

ئـــەو کەسەی کـە بێبـــــاوەڕە
زۆر گـەمژەیـە و قـوڕ بەســـــەرە
ئەو کەسەش باوەڕی هەبێـــــت
بـاوەڕدار و دیـــن پـــــــەروەرە

❋ ❋ ❋

تۆ هەژار بوویت پێغەمبەر گیـــان
بێ دایك و باوك ، چاو بە گریـــان
بەڵام کاتێك دینی خوا هـــــات
سەری خستی خوای میهرەبـــــان

❋ ❋ ❋

ئێمەی منداڵی کوردستـــــان

هاوار دەکەین پێغەمبەر گیـــان

شوێنکەوتەی تۆین موسڵمانیـــن

دەست بەردار نابین لە قورئـــان

**نهاد جلال حبيب الله**

## با بخوێنین

بـا بخوێنیـن منداڵی کـــورد

ئازا و بە پەلە و دەست و بـرد

ڕێگە نەدەین بە نــەزانـــــی

بڵێیـــن نەخوێنـدەواری مـــرد

* * *

پێغەمبەرمان فێرمان دەکـات

ئەوەی بۆ زانست هەوڵ بـــدات

خوای گەورە زۆر خۆشی دەوێت

هەموو کاتێك سەری دەخـــات

* * *

کـــاتێك کە قـــورئان دابـــەزی

(إقــرأ) وترا تـا ڕاپـــــــەڕی

ئەگەر قورئانت خۆش دەوێـــت

بخوێنە تـــاکو ســـرکــــەوی

* * *

سـەیـرکـە دنیا پێشکەوتـــووە

بەس موسڵمانـە خـەوتــــووە

دەبێت هەستیـن و گشت بـڵێیـن

موسڵمان قــەت نـــەمـــردووە

* * *

بـا بخوێنین تا سـەرکـەویـن

هەتا فێر نەبیـن نـەسرەویـن

چونکە پێغەمبەرمان فـەرمـووی

تەمبەڵ نـەبیـن و بخوێنیـن

نهاد جلال حبيب الله

## خۆشمان دەوێی

پێغەمبەر گیان ئەی ئازیزمان خۆشمان دەوێـی

مـوسڵمانیـن بەگوێت ئەکەین هـەرچی بڵێی

تۆ خەڵاتی خوای گەورەی بۆ گشت جیهـان

نەزانە ئەو کەسەی نابێت بە مـوسـڵمـان

تـۆ هاتیـت قورئانـت هێنـا بـەدیـاری

بـە هاتنت دنیا خۆش بـوو ڕەحـمەت بـاری

محمد ئەی پێغەمبەری تەنیـا و بێ کـەس

فێرت کردین کەسی نەمر خـودایـە و بـەس

گیان و ماڵمان قوربانت بێـت پێغەمبەرمـان

خۆشمان دەوێی هەر تۆی مامۆستا و ڕابەرمـان

نهاد جلال حبيب الله

# ئەی پێغەمبەر

ئـەی پێغەمبـەر... ئـەی پێغەمبـــەر!

مـــژدە هـێنــەر و تـرسـێـنــــــەر

بـــەڕاستی پێغەمـبــەری خـــــوای

تـــــۆ لـــوتـکەی بـــاوەڕ و تـــەقوای

تۆ پـێشـەنـگی خـوانـاسـانـــــی

هـەر تــۆ داڵـدەی بـێ کـەسـانــــی

ئــــەی نـێــردراوی خــوای مـــەزن

قــوربـانــی تــۆ بێت گـیـانـی من

تۆ بوویت کە خودات پێمان نـاسـانــد

تـــۆ تـــۆوی بـــاوەڕت وەشـانــــد

ئێمە هەمـوو قـــەرزاری تـــۆیـــــن

هــــەمـــومـــان مـنـەت بـاری تۆین

لـە ئـاگـــر دەمـــان پـــارێزێـــت

ئـــــای کـــە دڵسـۆز و بـــەڕێزیــت

جمال حبيب الله

# سەرچاوەکان

١ـ ابن اسحاق: السيرة النبوية، حققه و علق عليه و خرج أحاديثه: احمد فريد المزيدي، الطبعة الاولى، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان، ١٤٢٤ الهجرية.

٢ـ ابن هشام: السيرة النبوية، تحقيق وضبط وشرح: مصطفى السقا واخرون، الطبعة الثانية، دار ابن كثير، بيروت لبنان، ١٤٢٤ الهجرية.

٣ـ ابن خياط: تأريخ الخليفة ابن خياط، راجعه وضبطه: د. مصطفى نجيب فوّاز والدكتورة حكمت كشلي فوّاز، الطبعة الاولى، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان، ١٤٢٥ الهجرية.

٤ـ ابن تيمية: مجموعة الفتاوى، اعتنى بها وخرج احاديثها: عامر الجزار و أنور الباز، الطبعة الاولى، مكتبة العبيكان، ارياض، ١٤١٩ الهجرية.

٥ـ ابن الجوزي: صفة الصفوة، تحقيق، د. حامد احمد الطاهر، الطبعة الاولى، دار الفجر، القاهرة، ١٤٢٤ الهجرية.

٦ـ ابن كثير: البداية والنهاية، تحقيق: د. حامد احمد الطاهر، الطبعة الاولى دار الفجر، القاهرة، ١٤٢٤ الهجرية.

٧ـ ابن الاثير: الكامل في التأريخ، حققه واعتنى به، د. عمر عبدالسلام التدمري، دار الكتب العربية، بيروت، لبنان، ١٤٢٧ الهجرية.

٨ـ ابن قيم الجوزية: زاد المعاد في هدى خير العباد، تحيقي: د. مصطفى عبدالقادر عطا، الطبعة الثانية، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان ١٤٢٣ الهجرية.

٩ـ د. علي محمد محمد الصلابي: السيرة النبوية، الطبعة الثالثة، دار المعرفة، بيروت، لبنان ١٤٢٦ الهجرية.

١٠ـ محمود شاكر: خاتم الانبياء والمرسلين، الطبعة الاولى، المكتب الاسلامي، بيروت و دمشق، ١٤٢٧ الهجرية.

١١ـ د. حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلام، الطبعة الخامسة عشر، دار الجيل، بيروت و قاهرة وتونس ١٤٢٢ الهجرية.

١٢ـ د. محمد سعيد رمضان البوطي: فقه السيرة النبوية، الطبعة الخامسة عشر، دار السلام، مصر، ١٤٢٦ الهجرية.

١٣ـ د. محمد عبدالقادر أبو فارس: الصراع مع الصليبيين، الطبعة الاولى، دار البشير، طنطا، ١٩٩٩ ميلادية.

١٤ـ د. حامد احمد الطاهر: حياة الصحابة للاطفال، الطبعة الاولى، دار الفجر،القاهرة، مصر، ١٤٢٥ الهجرية.

١٥ـ د. عبدالرحمن رأفت الباشا: صور من حياة الصحابة.

١٦ـ خالد محمد خالد: هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر، وەرگێڕانی: سهام بەرزنجی، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ساڵی ١٤٢٣ی کۆچی.

١٧ـ حبيب محمد شعيد: ژیانی ئازیزمان، چاپی یەکەم، نشر إحسان، تهران، ساڵی ٢٠٠٧ زایینی.

١٨ـ شێخ عبدالعزیز پارەزانی: ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد(ﷺ)، لێکۆڵینەوەی: ڕزگار کەریم، چاپی یەکەم، نەشری إحسان، ساڵی ٢٠٠٤ی زایینی.

١٩ـ عەبدول عەزیز عەلائەدین مستەفا: ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر.

٢٠ـ محمد ملا فائق الشهرزوری، ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ١٤٢٢ی کۆچی.

٢١ـ د. وهبة الزحيلي: الفقه الاسلامي وادلته، الطبعة الرابعة، دار الفكر، دمشق، ١٤٢٠ الهجرية.

٢٢ـ محمد قطب: چۆن بانگەوازی خەڵك بکەین.

٢٣ـ محمد قطب: چەمکانێ دەبێت ڕاست بکرێنەوە، وەرگێڕانی: ژیوان گەلاڵی، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٣ی زاینی.

٢٤ـ د. علي محمد الصلابي: سيرة ابو بكر الصديق، سيرة عمر بن خطاب، سيرة علي بن ابي طالب، سيرة الحسن بن علي بن ابي طالب، الطبعة الثانية، دار المعرفة، بيروت، لبنان، ١٤٢٦ الهجرية.

# ناوەڕۆك


پێشکەشە بە:............ ٣
پێشەکی چاپی دووەم ............ ٥
بۆ خوشك و برا ئازیزەکانم............ ٦
بەشی یەکەم: شوێنی لە دایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ)............ ٧
ڕەچەڵەکی پێغەمبەر(ﷺ):............ ٨
ژیانی منداڵی پێغەمبەر(ﷺ) ............ ١٣
* ڕووداوێکی گرنگ: ............ ١٥
* گەشت و سەفەری پێغەمبەر لەگەڵ دایکیدا: ............ ١٦
* ڕووداوێکی دڵتەزێن:............ ١٦
* ژیان لەگەڵ باپیریدا: ............ ١٧
* خوای گەورە پێغەمبەر دەپارێزێت: ............ ١٨
* پێغەمبەر کاری بازرگانی فێر دەبێت: ............ ٢٠
* پێغەمبەر فێری جەنگ دەبێت: ............ ٢١
* هاوپەیمانێتی (فضول):............ ٢٢
* بازرگانی پێغەمبەر بۆ خەدیجە: ............ ٢٣
* ژن هێنانی پێغەمبەر: ............ ٢٤
پێغەمبەر و خەدیجە چەند منداڵێکیان دەبێت کە ئەمانەن: ............ ٢٦
* بنیادنانەوەی کەعبە: ............ ٢٧
پرسیارەکانی بەشی یەکەم............ ٢٩
بەشی دووەم: دابەزینی سروش (وەحی) بۆ پێغەمبەر(ﷺ)............ ٣١
* بانگەواز بە نهێنی:............ ٣٥
* موسڵمان بوونی ماڵی پێغەمبەر(ﷺ): ............ ٣٥
* موسڵمان بونی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب): ............ ٣٦

* موسڵمان بوونی (ئەبو بەکری صدیق): ........ ٣٧
* پێغەمبەر(ﷺ) چ وانەیەکی فێری هاوەڵان کرد؟ ........ ٤١
پرسیارەکانی بەشی دووەم ........ ٤٤
بەشی سێیەم: بانگەوازی ئاشکرا ........ ٤٥
* ئازاردانی موسڵمانان: ........ ٤٧
* چەند نموونەیەکی ئازاردانی موسڵمانان: ........ ٥٣
١ـ ئەبو بەکری صدیق: ........ ٥٣
٢ـ بێباوەڕان دەیانەوێت پێغەمبەر(ﷺ) پەشیمان بکەنەوە: ........ ٥٥
٣ـ ئازاردانی عەممار و شەهیدکردنی دایك و باوکی: ........ ٥٦
٤ـ بیلالی حەبەشی: ........ ٥٨
٥ـ خەبابی کوڕی ئەرەت: ........ ٥٩
* پیلانەکانی بێباوەڕان هەڵدەوەشێنەوە: ........ ٦٠
* ئابلۆقەدانی موسڵمانان: ........ ٦٢
* خوای گەورە چارەسەر دەنێرێت: ........ ٦٤
بەشی چوارەم: کۆچکردن ........ ٦٧
* کۆچی دووەم بۆ حەبەشە: ........ ٧٠
* قورەیش هەوڵی گەڕانەوەی موسوڵمانان دەدەن: ........ ٧١
* غەمباری پێغەمبەر(ﷺ): ........ ٧٣
پێغەمبەر(ﷺ) دەچێت بۆ (تائیف): ........ ٧٥
* ڕووداوی ئیسرا و میعراج: ........ ٧٧
* پێغەمبەر(ﷺ) دەچێت بۆ لای هۆزەکان: ........ ٨١
* موسڵمان بوونی چەند کەسێکی مەدینە: ........ ٨٢
* بەڵێنی دووەمی عەقەبە: ........ ٨٤
* کۆچکردنی موسڵمانان بۆ مەدینە: ........ ٨٥
پرسیارەکانی بەشی چوارەم ........ ٩١

بەشی پێنجەم: کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە ........ ٩٣
پلانی بێ باوەڕان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ): ........ ٩٣
* پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر لە ئەشکەوتدا: ........ ٩٦
* دایکە مەعبەد: ........ ٩٨
* سوراقە دەیەوێت پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت: ........ ٩٩
* هەندێ ڕووداوی تر لە کۆچکردنەکەدا: ........ ١٠٠
* موسڵمانانی مەدینە پێشوازی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن: ........ ١٠١
پرسیارەکانی بەشی پێنجەم ........ ١٠٤
بەشی شەشەم: کارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینەدا: ........ ١٠٥
١) دروستکردنی مزگەوت: ........ ١٠٥
ـ مزگەوتەکە چەند شوێنێکی تێدابوو کە ئەمانە بوون: ........ ١٠٥
٢) بانگدان لە مزگەوتدا: ........ ١٠٧
٣) برایەتی نێوان ئەوس و خەزرەج: ........ ١٠٩
٤) برایەتی نێوان کۆچبەرەکان و پشتیوانەکان: ........ ١١٠
٥) نووسینی پەیماننامە یان بەڵێننامە: ........ ١١١
٦) کاری جەنگی و سەربازی: ........ ١١٣
پرسیارەکانی بەشی شەشەم ........ ١١٦
بەشی حەوتەم: جەنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ........ ١١٧
* یەکەم: جەنگی بەدر: ........ ١١٧
* کاتی جەنگ کردنەکە: ........ ١٢١
* دەست پێ کردنی جەنگەکە: ........ ١٢٢
* کوژرانی ئەبو جەهل: ........ ١٢٣
* هەڵوێستی موسڵمانان لەگەڵ گیراوەکاندا: ........ ١٢٤
* ئەنجامەکانی جەنگی بەدر: ........ ١٢٧
* هەوڵی کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ): ........ ١٢٧

پرسیارەکانی بەشی حەوتەم ........................ ١٢٩

بەشی هەشتەم: ـ جەنگی ئوحود ........................ ١٣١

* جەنگی ئوحود: ........................ ١٣٣

* هۆکارەکانی جەنگەکە: ........................ ١٣٣

* مشت و مڕی نێوان موسڵمانان: ........................ ١٣٥

* سوپای موسڵمانان لە مەدینە دەچنە دەرەوە ........................ ١٣٥

* ڕووداوەکانی ناو جەنگەکە: ........................ ١٣٨

* ئەنجامی جەنگەکە: ........................ ١٤٠

پرسیارەکانی بەشی هەشتەم ........................ ١٤٢

بەشی نۆیەم: ـ لە جەنگی ئوحودەوە تا دوای جەنگی خەندەق ........................ ١٤٣

ژن هێنانی پێغەمبەر(ﷺ): ........................ ١٤٤

* لە دایك بوونی حەسەنی کوڕی عەلی: ........................ ١٤٥

* زەید فێری زمانی جولەکەکان دەبێت: ........................ ١٤٦

* دەرکردنی جوولەکەکانی بەنو (نچیر): ........................ ١٤٧

* چەند جەنگێکی تری پێغەمبەر(ﷺ): ........................ ١٤٨

* جەنگی بەنی موستەلەق: ........................ ١٤٩

ژنهێنانی پێغەمبەر(ﷺ): ........................ ١٤٩

* دووڕووەکان درۆ هەڵدەبەستن بۆ عائیشە: ........................ ١٤٩

* جەنگی خەندەق (ئەحزاب): ........................ ١٥٠

* هەڵکەندنی خەندەقەکە: ........................ ١٥١

ڕووداوەکەی (حذیفة): ........................ ١٥٣

پرسیارەکانی بەشی نۆیەم ........................ ١٥٦

بەشی دەیەم: ـ ڕێککەتننامە و ئازادکردنی مەککە ........................ ١٥٧

* ڕێککەوتننامەی حودەیبیە: ........................ ١٥٨

ئەنجامی ڕێککەتننامەکە: ........................ ١٦٣

جەنگی خەیبەر: .......... ١٦٥
* سەردانی ماڵی خوا: .......... ١٦٦
* موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص: .......... ١٦٨
* جەنگی مۆتە: .......... ١٦٩
* جەنگی ذاتو سەلاسل: .......... ١٧٠
* ڕزگارکردنی مەککە: .......... ١٧١
پرسیارەکانی بەشی دەیەم .......... ١٧٢
بەشی یانزەهەم: لە دوای ئازادکردنی مەککە تا کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) .......... ١٧٥
جەنگی حونەین: .......... ١٧٥
هێرشکردنی بۆ تائیف: .......... ١٧٦
* جەنگی تەبووک: .......... ١٧٨
* حەجی ماڵئاوایی: .......... ١٨١
* کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ): .......... ١٨١
* هەڵوێستی عومەری کوڕی خەتاب: .......... ١٨٢
پرسیارەکانی بەشی یانزەهەم .......... ١٨٣
بەشی دوانزەهەم: لە ژیانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەمانە فێر دەبین: .......... ١٨٤
بەشی سیانزەهەم: کۆمەڵێك شیعر بۆ منداڵان .......... ١٩٥
سەرچاوەکان .......... ٢٠٩
ناوەڕۆك .......... ٢١٢

# بەرهەمەکانی نووسەر

## نووسینەکان

١. ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەک و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا). (چاپکراوە).
٢. ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ). (بەرگی یەکەمی ئامادەیە بۆ چاپ).
٣. ژیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان. (ئەم بەرهەمەیە).
٤. ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان. (چاپکراوە).
٥. ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان(چاپکراوە).
٦. پێناسی هاوەڵان(ﷺ).(چاپکراوە).
٧. هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان.(چاپکراوە).
٨. ڕوانینێك بۆ مێژووی ئیسلامی(ئامادەیە بۆ چاپ).
٩. هەنگاوێك بەرەو هاوسەرگیری. (چاپکراوە).
١٠. ئیماناسی(چیرۆك) (چاپکراوە).

## وەرگێڕانەکان

١١. چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك (چاپکراوە).
١٢. پوختەی مێژووی ئیسلامی: د.محمد سهیل طقوش (چاپکراوە).
١٣. دەوڵەتی ئومەوی: پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالشافی محمد عبداللطیف (چاپکراوە).
١٤. مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش. (چاپکراوە).
١٥. دەوڵەتی سەلجووقیەکان: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕان بەهاوکاری شاهۆ عومەر عارف( چاپکراوە).
١٦. مەغۆل لە مێژوودا: د.فؤاد عبدالمعطی الصیاد(چاپکراوە).
١٧. مێژووی ئەییووبی و مەملووکیەکان: د. أحمد مختار العبادی (چاپکراوە).

١٨. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێرانی بە هاوکاری أحمد عبدالرحمان أحمد (چاپکراوە).

١٩. پوختەی شارستانیەتی ئیسلامی، نووسینی: د.رحیم کاظم محمد الهاشمی و أ. عواطف محمد العربی شنقارو.

٢٠. جەنگە گەورەکانو فتوحاتە ئیسلامیەکان: محمد سعید مرسی (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢١. سەرچاوەکانی ئیمامی تەبەری (نامیلکە) نووسینی:د.محمد أمحزون، لە ماڵپەری ئەیووبی بڵاوکراوەتەوە.

٢٢. پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان، محمود شاکر، بە هاوکاری مامۆستا مووسا. (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٣. پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن. (چاپکراوە).

٢٤. مێژووی نوێی ئەورووپا: چەند نووسەرێك، وەرگێڕان بە هاوکاری فاررووق محمد محمدأمین (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٥. فیکری رۆژئاوا، ئەنوەرلجوندی.(چاپکراوە).

٢٦. بەراوردی ئایینەکان، نووسینی أنور الجندی. (چاپکراوە).

٢٧. بەراوردێك لەنێوان غەزالیو ئیبن تەیمیەدا: د.محمد رشاد سالم ( ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٨. ژیانی هاوەڵان( سێ بەرگ)، نووسینی: محمد یوسف الکاندهلوی.(چاپکراوە).

٢٩. رەوتە هەناردەکان، نووسینی: أنور الجندی.چاپکراوە.

٣٠. بەگەورەدانانی خواو حوکمی ئەوەی قسەی پێ دەڵێت(نامیلکە)، نووسینی :د.عبدالعزیز الطریفی، لە ماڵپەری ئیسلام هاوس بڵاوکراوەتەوە.

